(القاضي عياض -رحمه الله-) دەڵێت: "بەشێك لە ڕوونكردنەوەی ئەو شتانەی لە بابەتەكانی كوفرە و ئەوەشی وەستان یان ناكۆكی تیایە، وە ئەوەشیان كە كوفر نییە: بزانە كە بەجێهێنان و وردبوونەوەی ئەم بەشە و خستنەڕووی تێكەڵ كردن تیایدا سەرچاوەكەی شەرعە، هیچ بوارێكی تیادا نییە بۆ عەقڵ". [٧] وتەكەی كۆتایی هات.

شێخی ئیسلام (ابن تيمیه -رحمه الله-) دەڵێت: "تەكفیر حوكمێكی شەرعییە، دەبێتە هۆی حەڵاڵكردنی ماڵ و سامان، و ڕشتنی خوێن، و حوكمدان بە مانەوە لە ئاگر بە نەمری، بۆیە سەرچاوەكەی وەك سەرچاوەی تەواوی حوكمە شەرعییەكانە". [٨]

وە دەڵێت -رحمه الله- :" كوفر و فیسق حوكمانێكی شەرعییە، لەو حوكمانە نییە كە عەقڵ بیدات؛ بۆیە كافر ئەوەیە كە الله و پێغەمبەرەكەی بە كافریان داناوە، و فاسق ئەوەیە كە الله و پێغەمبەرەكەی بە فاسقیان داناوە، هەروەك ئیماندار و موسڵمانیش ئەویە كە الله و پێغەمبەرەكەی بە ئیماندار و موسڵمانیان داناوە..-تاوەكو ئەو شوێنەی دەڵێت: -ئەم بابەتانە هەموویان چەسپاوە بە شەرع". [٩]

وە دەڵێت -رحمه الله-: "ئیمان و كوفر لەو حوكمانەیە بە بە ڕیسالە چەسپاوە و جێگیربووە، وە بە بەڵگەی شەرعی ئیماندار و كافر لە یەكتر جیادەكرێنەوە، نەك بە بەڵگەی عەقڵی". [١٠] وتەكەی كۆتایی هات.

(ابن القيم -رحمه الله) دەڵێت: الكفر حق الله ثم رسوله *** بالنص يثبت لا بقول فلان

من كان رب العالمين وعبده*** قد كفراه فذاك ذو الكفران[١١]

واتە: تەكفیركردن مافی الله و پاشان پێغەمبەرەكەیەتی*** بە دەق جێگیربووە نەك بە وتەی فڵان

هەركەسێك پەروەردگاری جیهانیان و بەندەكەی*** تەكفیریان كردبێت ئەوا ئەو كەسە كافرە.

(ابن الوزير الصنعاني -رحمه الله-) دەڵێت: "بەڵگە لەسەر كوفر و فیسق تەنها بە بیستراوی قەتعییە، وە هیچ ناكۆكییەك لەمەدا نییە". [١٢] وتەكەی كۆتایی هات.

بە گوێرەی ئەمە دەڵێین: هەر كەسێك نەزان بێت بە حوكمی شەرع لە دەربارەی یەكێك لە كافران یان موشریكەكان یان یەكێك لە كۆمەڵەكانیان: حوكمی وەك حوكمی ئەو كەسە نابێت كە شیركی بڕیارداوە، چونكە ئەو كەسەی شیركی بڕیارداوە بنچینەی دینی هەڵوەشاندووەتەوە؛ هەروەك باسمان كرد لە ئەڵقەی ڕابردوو، بەڵكو حوكمەكەی وەك حوكمی ئەو كەسە وایە نەزانە بە دانراوێك یان فەرزێك لە فەرزەكانی ئیسلام، جا هەر

(٧) الشفا بتعريف حقوق المصطفى (٢٨٢/٢).

(٨) بغية المرتاد في الرد على المتفلسفة و القرامطة و الباطنية(ص٣٤٥).

(٩) منهاج السنة النبوية(٩٢/٥).

(١٠)مجموع الفتاوى(٣٢٨/٣).

(١١)الكافية الشافية(ص٨٥٨).

(١٢)العواصم والقواصم(١٧٩/٤).

کەسێك بەڵگەی ڕیسالی لەسەر جێگیر بووبێت لەمەدا ئەوا کوفرە، و ئەو کەسەش کە بەڵگەی ڕیسالی پێنەگەیشتووە لەمەدا ئەوا کافر نییە، بە پێچەوانەی ئەو کەسەی نەزانە بە تەوحید؛ کە بریتییە لە بنچینەی دین؛ ئەوکاتە کافرە بە کوفری نەزانین.

لەمەشدا زانایان بەدوادا هاتوونە لەسەر جیاوازی کردن لە نێوان نەزانی بە بنچینەی دین و نەزانی بە واجبە شەرعییەکان:

(الإمام محمد بن نصر المروزي) وتەی کۆمەڵێك لە فەرموودەناسان دەگوازێتەوە کە دەڵێن: "کاتێك ناسینی الله ئیمانە و نەزانین و نەناسینی کوفرە، وە کارکردن بە فەڕزەکان ئیمانە و نەزانین پێی بەر لە دابەزینی کوفر نییە ... تاوەکو ئەوەی دەڵێن: بەڵکو ئەو کەسە تەکفیر دەکرێت کە نکوڵی لێ دەکات و ڕەتی دەکاتەوە ئەمەش بەهۆی ئەوەی خەبەری الله بەدرۆدەخاتەوە، ئەگەر خەبەرێك لە الله ـەوە نەهاتبێت بە نەزانی پێی کافر نابێت، و دوای گەیشتنی خەبەرەکەش ئەو کەسەی لە موسڵمانان گوێی لە خەبەرەکە نەبێت بەهۆی نەزانینیەوە کافر نابێت، وە نەناسینی الله لە هەموو حاڵێکدا کوفرە، بەر لە هەواڵ پێدان و دوای هەواڵ پێدان". [١٣] وتەکەی کۆتایی هات -رحمه الله-.

سەبارەت بە شێوەی جێگیرکردنی بەڵگە (إقامة الحجة) و چۆنیەتی هێنانەدی ئەم مەرجە بەر لە تەکفیر کردن، ئەمەیان جیاواز دەبێت بەپێی ئاشکرایی و شاراوەیی بابەتەکە، جار وایە بەڵگە جێگیر دەبێت تەنها بە بوونی کەسی وەستاو لە تەکفیر لە بنچینە و سەرچاوەی زانینەوە بێت، بە جۆرێك بە وەستانەکەی پشت تێکردوو بێت نەك نەزان، وە بەشێوەیەك کە عوزر ناهێنرێتەوە مەگەر بۆ کەسێك تازە موسڵمان بووبێت، یان لە دەشتێکی دوور ژیابێت، وە دەشێت جێگیرکردنی بەڵگە بە ڕوونکردنەوەی دەقی شەرعی بێت کە بەڵگە بێت لەسەر کوفری کەسێك فڵانە کار بکات یان فڵانە قسە بکات، تەنها بە گەیشتنی قورئان بەگشتی بەس نییە، وە دەشێت جێگیرکردنی بەڵگە بە ڕوونکردنەوەی بەڵگەکە بێت لەگەڵ لادانی شوبهەکە و وەڵامدانەوە دەربارەی بەڵگەی کەسی بەرهەڵست، وە ڕوونکردنەوەی زیاتر بۆ ئەم بابەتە دەکەین لە کاتی باسکردنی پلەکانی وەستاوەکان (لە تەکفیرکردن).

---

(١٣) تعظيم قدر الصلاة(٢/٥٢٠).

## چەندین بەڵگە هەیە لەسەر جیاوازی کردن لە نێوان نەزانی بە فەرز و دانراوەکان و نەزانی بە بنچینەی دین یاخود لەسەر ئەوەی تەکفیرکردنی موشریکەکان لە حوکمەکانە نەك لە بنچینەی دین، لەوانە:

هەموو پێغەمبەران -علیهم السلام- لەگەڵ گەلەکانیان بە بانگەوازکردن بۆ عیبادەتی الله بەتەنها کە هاوبەشی نییە، دەستیان پێکرد، خۆ ئەگەر نەزانی بە حوکمەکانی تەکفیر کوفر بووایە ئەوا ساتێك درەنگ نەدەکەوتن لە ڕوونکردنەوەیان لە چوارچێوەی ڕوونکردنەوەی بنچینەی دین.

بە هەمان شێوە لە بەڵگەکان لەسەر لێك جیاکردنەوەی ئەوەی تەکفیر لە واجبەکانی دینە و حوکمێکی شەرعییە و لە بنچینەی دین نییە، ئەوەیە کە لە صەحابەوە (ڕەزای خوای پەروەردگاریان لێ بێت) جێگیربووە، ئەوانەی کە وەستان لە تەکفیرکردنی کۆمەڵێك کە کەوتبوونە ڕیدەوە (هەڵگەرانەوە)، و پێیان وتن موسڵمان، جا کاتێك ئەو ئایەتانەی کوفری ئەو کۆمەڵەیەی ڕوون کردەوە دابەزین، تەوبەیان نەکرد لە وەستانەکەیان، لە کاتێکدا جێگیربووە کە یەکێك لە صەحابە کەوتە نێو شیرکەوە بە نەزانی، و لەگەڵ ئەوەشدا صەحابە تەکفیریان کرد، و پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمانی پێکرد ئیسلامەکەی نوێ بکاتەوە و ئیمان بهێنێتەوە، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر جیاوازی لە نێوان ئەو کەسەی دەکەوێتە شیرکەوە بە نەزانی، و ئەو کەسەش نەزانە بە حوکمە شەرعییەکان.

لە (ابن عباس ـەوە -ڕەزای خوای پەروەردگاریان لێ بێت-) دەڵێت: "کۆمەڵێك لە خەڵکی مەککە هەبوون موسڵمان بوون، و ئیمانەکەیان شاردبووەوە، جا موشریکەکان لەگەڵ خۆیان هێنایانن لە ڕۆژی بەدر، ئینجا هەندێکیان بریندار بوون و هەندێکیان کوژران، جا موسڵمانان وتیان: "ئەم موسڵمانانە هاوڕێمان بوون و زۆریان لێکرا بۆیە داوای لێخۆشبوونیان بۆ بکەن"، ئینجا ئەم ئایەتە دابەزی:{إِنَّ الَّذِينَ تَوَفَّاهُمُ الْمَلَائِكَةُ ظَالِمِي أَنفُسِهِمْ قَالُوا فِيمَ كُنتُمْ ۖ قَالُوا كُنَّا مُسْتَضْعَفِينَ فِي الْأَرْضِ ۚ قَالُوا أَلَمْ تَكُنْ أَرْضُ اللَّهِ وَاسِعَةً فَتُهَاجِرُوا فِيهَا ۚ فَأُولَٰئِكَ مَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ ۖ وَسَاءَتْ مَصِيرًا} (النساء: ٩٧) ، واتە: بەڕاستی ئەوانەی لە سەرە مەرگدا فریشتە گیانیان دەکێشن لە کاتێکدا ئەوان هەمیشە ستەمیان لە خۆیان دەکرد (ئیمان و باوەڕیان لە مەترسیدا بوو کەچی کۆچیان نەدەکرد بۆ نیشتمانی ئیمان، بەتوندی پیایاندا هەڵدەشاخێن) و دەڵێن: باشە ئێوە لە چیدا بوون و لە کوێ ژیانتان دەبردە سەر؟! لە وەڵامدا دەڵێن: ئێمە بێ دەسەڵات و لاواز کراو بووین لە زەویدا، فریشتەکان دەڵێن: باشە ئایا زەوی خوا فراوان نەبوو تا کۆچی تێدا بکەن (کۆچ بکەن بۆ نیشتمانێك کە ئیمانداران تیایدا فەرمانڕەوان یاخود سەربەستن) ئا ئەوانە جێگایان دۆزەخە، کە ئەویش چارەنووسێکی نالەبار و خراپە.

وتی: جا ئەم ئایەتەی نووسی بۆ ئەو موسڵمانانەی مابوون و هیجرەتیان نەکردبوو، و ئیتر هیچ عوزرێکیان نییە، وتی: جا موسڵمانەکان لە مەککە دەرچوون بۆ هیجرەت پاشان موشریکەکان شوێنیان کەوتن و پاشگەزیان

کردنەوە لە ئیسلام، ئینجا ئەم ئایەتە دەربارەیان دابەزی: {وَمِنَ النَّاسِ مَن يَقُولُ آمَنَّا بِاللَّهِ} (العنكبوت: ١٠) تا کۆتایی ئایەتەکە. [١٤]

شێخ (عبد الله بن محمد بن عبد الوهاب -رحمهم الله-) دەڵێت: "جا الله ئەم ئایەتەی دابەزاند، و تیایدا حوکمی ئەم موشریکانەی ڕوونکردەوە، و بوونە نیشتەجێی ئاگر سەرەڕای شەهادە هێنانیان". [١٥] وتەکەی کۆتایی هات.

لە (سعد بن أبي وقاص ـەوە -رضي الله عنه-) دەڵێت: ئێمە هەندێك شتمان باس دەکرد، و منیش تازە موسڵمان ببووم، جا سوێندم خوارد بە لات و عوزا، ئینجا هاوەڵانی رسول الله (ﷺ) پێیان وتم: شتێکی خراپت وت، وەرە بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ) و هەواڵی پێبدە؛ بەڕاستی ئێمە وا دەبینین کە کوفرت کرد، جا پێیگەیشتم و هەواڵم پێدا: ئەویش فەرمووی: ((بڵێ: لا إله إلا الله وحده سێ جار، و سێ جاریش پەنا بگرە لە شەیتان، و تف بکە لە لای چەپت سێ جار، جارێکی تر دووبارەی مەکەرەوە)). [١٦]

(ابن الوزير الصنعاني -رحمه الله-) وەك سەرنجێك لەسەر ئەم فەرموودەیە دەڵێت: "ئەمە فەرمانکردنە بە نوێکردنەوەی ئیسلام و ئیمان هێنان". [١٧] وتەکەی کۆتایی هات.

(ابن العربي المالكي -رحمه الله-) دەڵێت: "هەر کەسێک لە بازنەی ئیسلام دا سوێندی خوارد بە لات و عوززا و مەبەستی پێی دڵنیا کردنەوە و زیاتر چەسپاندنی سوێندەکەی بوو ئەوە بێ باوەڕە لە ڕاستیدا. ا.هـ[١٨]

شێخ (سليمان بن عبد الله -رحمه الله-) دەڵێت: "کۆمەڵێك لە زانایان وەریانگرتووە -واتە فەرموودەی سەعد -رضي الله عنه- و دەڵێن: ئەوەی سوێند بە جگە لە الله بخوات تەکفیر دەکرێت، دەڵێن: هەر بۆیەش پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی پێکرد ئیسلامەکەی نوێ بکاتەوە بە وتەی لا إله إلا الله، ئەگەر کوفرێك بوایە لە دین دەرینەکردایە ئەوا فەرمانی پێنەدەکرد بەمە، وە جمهوری زانایانیش دەڵێن، تەکفیر ناکرێت بەو کوفرەی لە دین دەریدەکات، بەڵکو لە شیرکی بچووکە". [١٩] وتەکەی کۆتایی هات.

بۆیە عوزری بۆ نەهێنرایەوە -ڕەزای خوای پەروەردگاری لێ بێت- لەمەدا سەرەڕای ئەوەی تازە موسڵمان ببوو و نزیك بوو لە سەردەمی نەفامی..

بە هەمان شێوە لە بەڵگەکان لەسەر لێك جیاکردنەوە لەوەی تەکفیر لە واجبەکانی دینە، و حوکمێکی شەرعییە

(١٤) رواه الطبري في تفسيره(١٠٢/٩) بسند صحيح.
(١٥) الدرر السنية (٢٤١/١٠).
(١٦) رواه النسائي في سننه(٣٧٧٦/٧/٧)بسند جيد.
(١٧) إيثار الحق على الخلق(ص٣٨٠).
(١٨) عارضة الأحوذي(٢٨/١).
(١٩) تيسير العزيز الحميد(ص٥٢٩).

و لە بنچینەی دیـن نییە کە عوزری بۆ کەس تیادا نییە: ئەوەی گێڕدراوەتەوە کاتێك صەحابە -رضي الله عـنهم- ناکۆك بوون لە تەکفیرکردنی هەندێك مورتەد، کاتێك الله تعالی کوفری ئەو کـۆمەڵەیەی ڕوونکـردەوە فەرمـانی نەکرد بەوەی وەستابوو لە تەکفیرکردنیان بە نوێکردنەوەی ئیسلامەکەی.

الله تعالی دەفەرموێت: {فَمَا لَكُمْ فِي الْمُنَافِقِينَ فِئَتَيْنِ وَاللَّهُ أَرْكَسَهُم بِمَا كَسَبُوا ۚ أَتُرِيدُونَ أَن تَهْدُوا مَنْ أَضَلَّ اللَّهُ ۖ وَمَن يُضْلِلِ اللَّهُ فَلَن تَجِدَ لَهُ سَبِيلًا * وَدُّوا لَوْ تَكْفُرُونَ كَمَا كَفَرُوا فَتَكُونُونَ سَوَاءً ۖ فَلَا تَتَّخِذُوا مِنْهُمْ أَوْلِيَاءَ حَتَّىٰ يُهَاجِرُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ ۚ} (النساء: ٨٨ - ٨٩) واتە: جا ئەوە چیتانە (ئەی ئیمانداران) دەربارەی دووڕووەکـان بوون بە دوو دەستەوە؟! لە کاتێکدا خوا (سەر شۆڕی کردوون) و وەری گێڕاونەتەوە بۆ بێ باوەڕی بەهۆی ئەو کردەوانەی کە کردوویانە، ئایا دەتانەوێت (دڵی) کەسێك هیدایەت و ڕێنموویی بکەن کە الله گـومڕای کـردووە (بەهۆی باوەڕی دانەمەزراو و دڵ و دەروونی نەخۆشیەوە)، بێگومان ئەوەی الله گـومڕای بکـات ئەوە هەرگیـز ڕێگەیەکت دەست ناکەوێت بۆ ڕێنموویی کردنی * (ئەو دووڕووانە) ئاواتەخوازن کە ئێوەش بێ باوەڕ بـن وەك خۆیان بێ باوەڕبوون، ئەو کاتە (هەردوولاتان) یەکسان دەبن لە بێ باوەڕیـدا، کەواتە لەوانە پشـتیوان و یـاوەر مەگرن هەتا کۆچ دەکەن لە پێناوی خوادا.

لە دەربارەی هۆکاری دابەزینیەوە بە صەحیحی هاتووە کە پێغەمبەر (ﷺ) دەرچوو بەرەو ئوحود، جـا خەڵکێـك گەڕانەوە لەوانەی لەگەڵیدا بوون، ئینجا هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) بوون بە دوو دەسـتە دەربارەیـان، هەنـدێکیان وتیان: "دەیانکوژین"، هەندێکی تریان وتیان: "نەخێر". [٢٠]

لە موجاهید ـەوە -رحمە الله- بە صەحیحی هاتووە کە دەڵێت: "کۆمەڵێك لە مەککە دەرچوون تـاوەکو گەیشـتنە مەدینـە خۆیـان وا دەرخسـت کە موهـاجیرن، پاشـان مـورتەد بـوونەوە دوای ئەوە، جـا مۆڵەتیـان خواسـت لە پێغەمبەر (ﷺ) بۆ چوونەوە مەککە؛ بۆ ئەوەی هەندێك کەلوپەلیان بهێننەوە بازرگـانی پێـبکەن، جـا ئیمانـداران ناکۆك بوون دەربارەیان، هەندێکیان وتیان: "ئەوانە مونافیقن"، هەندێکیان وتیان: "ئەوانە ئیمانـدارن"، بـۆیە الله دووڕوویيەکەیانی دەرخست و ڕوونکردەوە، و فەرمانی کرد بە جەنگکردن لە دژیان". [٢١]

هەر بەم واتایە لە (عبد الرحمن بن عوف وابن عباس -رضي الله عنهم) گێـڕدراوەتەوە، و لە شـێوەی ئەمەدا بە مورسەلی هاتووە لە چەند تابیعیێکەوە کە ئەوانیش: عكرمة، والسـدي، وقتـادة، ومحمـد بـن كعـب القرظـي -رحمهم الله.-

ئیمامی (الطبري -رحمە الله-) لە تەفسیری ئەم فەرموودەیەی الله تعـالی: {فَمَا لَكُمْ فِي الْمُنَافِقِينَ فِئَتَيْنِ وَاللَّهُ أَرْكَسَهُم بِمَا كَسَبُوا} (النساء: ٨٨)، دەڵێت: "واتە بەهۆی ئەمەوە: الله گەڕاندنیەوە بۆ حوکمەکانی موشریکەکان لە

(٢٠) متفق عليه، صحيح البخاري (١٣٩٩/١٠٥/٢)،صحيح مسلم(٧٨١/٥/٢).

(٢١) رواه الطبري في تفسيره (١٠٠٥٢/٩/٨) بسند صحيح.

حەڵاڵ كردنی خوێنیان، و بە كەنیزەكردنی نەوەكانیان". [٢٢] وتەكەی كۆتایی هات.

ئیمامی (الطبري) وای بە ڕاجح داناوە كە ئەم ئایەتە دەربـارەی كۆمەڵێـك دابەزی هەڵگەڕابـوونەوە لە ئیسـلام، كاتێك دوای ئەوەی باسی وتەكـانی سـەلەف دەكـات لە هۆكـاری دابەزینـی، دەڵێـت: "وە لە پێشـترین وتە بە ڕاستی و دروستی لەم وتانەدا لە دەربارەی ئەمە: ئەو وتەیەی دەڵێت: ئەم ئایەتە سەبارەت بە ناكۆكی هاوەڵانی رسول الله (ﷺ) دابەزی دەربارەی كۆمەڵێك لە خەڵكی مەككە كە هەڵگەڕابـوونەوە لە ئیسـلام دوای موسـڵمان بوونیان". [٢٣] وتەكەی كۆتایی هات.

(ابن أبي زمنـین -رحمـه الله-) دەڵێـت: " ئەوان كۆمەڵێـك بـوون لە مونافیقەكـان لە مەدینـە بـوون؛ جـا لەوێ دەرچوون بەرەو مەككە، پاشان لە مەككە دەرچـوون بـۆ یەمـامە بە بازرگـانی بـۆیە هەڵـگەڕانەوە لە ئیسـلام، و ئەوەی هەبوو لە شیرك لە دڵیان دەریانخست، جا موسڵمانان پێیان گەیشـتن، و بـوونە دوو دەسـتە دەربارەیـان؛ ئینجا هەندێكیان وتیان: خوێنیان حەڵاڵ بوو، ئەوانە موشریكی مورتەدن، وە هەندێكیان وتیان: خوێنیان حەڵاڵ نەبووە؛ ئەوانە كەسـانێكن دووچـاری فیتـنە بـوونەتەوە، بـۆیە الله تعـالی فەرمـووی: {فَـمَا لَكُـمْ فِي الْمُنَـافِقِينَ فِئَتَيْنِ}". [٢٤] وتەكەی كۆتایی هات -رحمه الله-.

بە هەمان شێوە لە بەڵگەكان ئەوەیە: كۆمەڵێك لە زانایان بە ڕاجحیان داناوە كە (عمـر بـن الخطـاب -رضي الله عنه-) وەستا لە تەكفیركردنی زەكاتـنـەدەرەكان لە سەرەتای ڕووداوەكـە، كاتێـك ئیمامـی ئەبـو بەكـر -رضي الله عنه- كوفرەكەیانی بۆ ڕوون كردەوە، ئینجا پەسـەندی ئەوی كـرد، وە داوای تەوبەی لێنەكـرا لەسـەر وەسـتانی دەربارەیان.

بە صەحیحی لە ئیمامی عمر ـەوە -رضي الله عنـە- هـاتووە كە بە ئیمامـی ئەبـو بەكـری وت -رضي الله عنـە- لە دەربارەی "مورتەدان" :چۆن دەجەنگی لەگەڵ ئەم خەڵكە؟ لە كاتێكدا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمـوویەتی: "أمـرت أن أقاتل الناس حتى يقولوا لا إله إلا الله، فمن قالها فقد عصم مني ماله ونفسه إلا بحقه، وحسابه عـلى الله".[٢٥]

واتە: فەرمانم پێكراوە بجەنگم لەگەڵ خەڵك تاوەكو دەڵێن لا إله إلا الله، جـا هەر كەسـێك بیڵێـت ئەوا مـاڵ و سامانی و گیانی لە من حەڕام و پارێزراو دەبێت، وە لێپرسینەوەی لەسەر الله ـیە.

هەندێك لە پێشـەوایانی سـەلەف -لە سـەرەتای ڕووداوەكە- دەوەسـتان لە تەكفیركردنـی ئەو كەسـەی دەڵێـت قورئـان دروسـتكراوە (مخلـوق)، وە هەیـان بـوو دەوەسـتا لە تەكفیركردنـی جەهمـیە سـەرەڕای ئاشـكرایی كوفرەكەیان، بەمەش نەبوونە كافر، كاتێكیش بەڵگەیان بۆ ڕوونكرایەوە ئیتر نەوەستان دەربارەیان، و

(٢٢) تفسير الطبري (٨/٧).

(٢٣) تفسير الطبري (١٣/٨).

(٢٤) تفسير القرآن العزيز لابن أبي زمنين (٣٩٣/١).

(٢٥) متفق عليه ، صحيح البخاري(١٨٨٤/٢٢/٣)،صحيح مسلم (٧١٣٢/١٢١/٨).

موسڵمانییتیەکەیان نوێ نەکردەوە بەهۆی ئەوەی لە پێشدا وەستابوون.

لە (يعقوب بن إبراهيم الدورقي) ـیەوە، دەڵێت: "پرسیارم کرد لە (أحمد بن حنبل) سەبارەت بەو کەسەی دەڵێت: قورئان مەخلوقە، جا وتی: "من تەکفیرم نەدەکردن تاوەکو ئەم ئایەتانەم خوێندەوە لە قورئان: {وَلَئِنِ اتَّبَعْتَ أَهْوَاءَهُم مِّن بَعْدِ مَا جَاءَكَ مِنَ الْعِلْمِ} (البقرة: ١٤٥)، وە ئایەتی: {وَلَئِنِ اتَّبَعْتَ أَهْوَاءَهُم بَعْدَ الَّذِي جَاءَكَ مِنَ الْعِلْمِ} (البقرة: ١٢٠)، وە ئایەتی: {أَنزَلَهُ بِعِلْمِهِ} (النساء: ١٦٦).[٢٦]

لە (ابن عمار الموصلي ـیەوە -رحمه الله-) دەڵێت: "(ابن المديني) پێی وتم: چی ڕێگریت لێ دەکات لەوەی تەکفیریان بکەیت؟! -واتە: جەهمیە- دەڵێت: وە من یەکەم کەس بووم ڕەتم دەکردەوە تەکفیریان بکەم تاوەکو (ابن المديني) ئەوەی وت کە وتی، جا کاتێك وەڵامم دایەوە دەربارەی فیتنەکە، نووسراوێکم بۆی نووسی یادی الله م کرد، و باسی ئەوەم کرد کە پێی وتبووم لە دەربارەی تەکفیرکردنیان". [٢٧]

بەمەش دێینە کۆتایی لە بابەتی یەکەم...

## ئێستاش دەست دەکەین بە ڕوونکردنەوەی بابەتی دووەم: کە بریتییە لەوەی ئایا هۆکار چییە لە کوفری کەسی وەستاو لە تەکفیرکردنی موشریکەکان.

وەڵام: بریتییە لە بەدرۆخستنەوەی حوکم و دانراوە شەرعییەکان و ڕەتکردنەوەیان.

بە سەیرکردنی دەقەکانی زانایان لەم هەڵوەشێنەرەوەدا بە ئاشکرا دەردەکەوێت لەوەی بڕیاریان داوە کە هۆکاری کوفر لە کەسی وەستاو لە کافر دەگەڕێتەوە بۆ بەدرۆخستنەوەی حوکمەکان و ڕەتکردنەوەیان، نەك لە ڕووی هەڵوەشاندنەوەی بنچینەی دین.

زۆربەی زانایان بەدوایدا هاتوون لەسەر باسکردنی ئەم هۆکارە بەپێی ئەوەی کوفرکردن بە نکوڵی و ڕەتکردنەوەی حوکمە متواترەکانی ئیجماع لەسەریان دەبێت، یاخود بە ڕەتکردنەوەی ئەوەی زانینی بە پێویست دانراوە لە دیندا.

شێخی ئیسلام (ابن تيمية -رحمه الله-) دەڵێت: "کوفرکردن بە ڕەتکردنەوەی ئەوەی زانینی بە پێویست دانراوە لە دیندا دەبێت، یان بە ڕەتکردنەوەی حوکمە متواترەکانی ئیجماع لەسەریان و هاوشێوەی ئەمانە دەبێت".[٢٨]

(٢٦) نقله ابن أبي يعلى في طبقات الحنابلة(٤١٤/١)عن كتاب الخلال، وإسناده جيد.

(٢٧) رواه الخطيب البغدادي في تاريخ بغداد (٤٢١/١٣) بسند صحيح.

(٢٨) مجموع الفتاوى (١٠٦/١).

## * ئەمەش هەندێك لە وتەكانی زانایان كە هۆكاری كوفری كەسی وەستاو لە كافر ـیان باسكردووە:

(القاضي عياض) هۆی تەكفيركردنی وەستاو لە جوولەكە و نەسارا و ئەوەشی واز لە دينی ئيسلام دێنێت ڕوونكردۆتەوە لەوەی كە (الباقلاني) نەقڵی كردووە، دەڵێت: "چونكە دەقەكان و ئيجماع ڕێككەوتوون لەسەر كوفريان، جا ئەوەی بوەستێت لەمەدا ئەوا دەقی بەدرۆخستۆتەوە، يان گومانی هەبێت، وە بەدرۆخستنەوە يان گومان كردن تيايدا كەس تێيناكەوێت تەنها كافر نەبێت". [٢٩] وتەكەی كۆتايی هات.

(ابن الوزير الصنعاني -رحمه الله-) لە تەكفيركردنی كەسی گومانبەر لە بتپەرست و ئەو كەسەشی تەكفيری ناكات دەڵێت: "هيچ هۆيەك نييە بۆ ئەمە تەنها ئەوە نەبێت كە كوفرەكەی زانينی بەپێويست دانراوە لە ديندا". [٣٠] وتەكەی كۆتايی هات.

شێخ (عبد الله بن محمد بن عبد الوهاب -رحمه الله-) هۆی تەكفيری ئەو كەسەی دەڵێت: (هەر كەسێك دوو شەهادەكە بدات ئەوا نابێت تەكفير بكرێت ئەگەرچی غەيری الله بپەرستێت) ڕوونكردۆتەوە، جا دەڵێت: "چونكە ئەوەی ئەم وتەيە دەڵێت بەدرۆخەرەوەی الله و پێغەمبەرەكەيەتی، وە ئيجماعی موسڵمانانيش". [٣١] وتەكەی كۆتايی هات.

هەندێك لە پێشەوايانی بانگەوازی نەجدی دەڵێن: "ئەو كەسەی تەكفيری موشريكەكان ناكات قورئانی بەڕاست دانەناوە، چونكە قورئان تەكفيری موشريكەكانی كردووە، و فەرمانی كردووە بە تەكفيركردنيان، و دوژمنايەتی و جەنگ كردن لە دژيان". [٣٢] وتەكەيان كۆتايی هات.

بەم ئەندازەيە دێينە كۆتايی، و تاوەكو ديدارێكی تر لە ئەڵقەی داهاتوو بە ويستی الله تعالی...

وە داوای يارمەتی و سەركەوتوويی و پێكان لە الله تعالی دەكەين، وصلى الله وسلم وبارك على عبده ورسوله محمد، وعلى آله وصحبه وسلم تسليما كثيرا...

---

(٢٩) الشفا بتعريف حقوق المصطفى(٢/٢٨٠).

(٣٠) الروض الباسم (٢/٥٠٩).

(٣١) الدرر السنية (١٠/٢٥٠).

(٣٢) الدرر السنية (٩/٢٩١).

## ئەڵقەی چوارەم

الحمد لله رب العالمين، والعاقبة للمتقين، ولا عدوان إلا على الظالمين، وأشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له الملك الحق المبين، وأشهد أن محمدا عبده ورسوله إمام الأولين والآخرين، أما بعد:

لەم ئەڵقەیەدا -بە یارمەتی الله تعالى- دوو بابەت تاوتوێ دەکەین:

یەکەم: ئایا تەکفیرکردنی موشریکەکان هەمووی لەسەر یەك پلە و ئاستە یان لەسەر چەند پلەیەکە...

دووەم: تیایدا باسی پلەکانی وەستاوەکان لە تەکفیرکردنی موشریکەکان دەکەین...

## ئێستاش دەست دەکەین بە بابەتی یەکەم: ئایا تەکفیرکردنی موشریکەکان هەمووی لەسەر پلە و ئاستێکە یان لەسەر چەند پلەیەك؟

وەڵام: لە زانایانەوە هاتووە لەسەر ئەوەی تەکفیر حوکمێکی شەرعییە و پلەی هەیە بەپێی دوو شت:

یەکەمیان: بەهێزی جێگیربوونەکەی لە شەرعدا؛ واتە ڕوونی و ئاشکرایی بەڵگە شەرعییەکە لەسەر کوفری فڵانە کەس لە خەڵك، کە ناسراوە بە ناسینی حوکم (معرفة الحكم)...

دووەمیان: بەهێزی جێگیربوونەکەی لەسەر ئەو کەسە دیاریکراوەی کەوتۆتە نێو شیرك یان کوفر، کە ناسراوە بە ناسینی بار (معرفة الحال)، ئەمەش لە ڕێگەی بینین یان بیستن یان شایەدی شایەدەکان دەبێت...

شێخی ئیسلام (ابن تيمية -رحمه الله-) دەڵێت: "تەکفیر حوکمێکی شەرعییە، دەگەڕێتەوە بۆ حەڵاڵ کردنی ماڵ و سامان، و ڕشتنی خوێن، و حوکمدان بە مانەوەی هەتا هەتایی لە ئاگردا، بۆیە سەرچاوەکەی وەك سەرچاوەی تەواوی حوکمە شەرعییەکانی ترە، جا جاری وایە بە دڵنیاییەوە دەزانرێت، جاری وایە بە گومانی زۆر و زاڵبوو دەبێت، و جاری وایە دوودڵ و ڕاڕایە تیایدا، جا هەرکات دوودڵی وگومان دروست بوو ئەوا وەستان لە تەکفیر لە پێشترە، وە دەستپێشخەری کردن لە تەکفیر بەڕاستی لەسەر سروشتی ئەو جۆرە کەسانە زاڵ دەبێت کە نەزانی بەسەریاندا زاڵ بووە". [1] وتەکەی کۆتایی هات -رحمه الله-.

ئەمەش بە پێچەوانەی بۆچوونی ئەو کەسەی وا دەزانێت هەموو وێنەکانی کوفر یان شیرك لەسەر یەك ئاست و پلەیە؛ بە جۆرێك لە زانینیان زانا و نەزان یەکسانن، گومان نییە لە پوچەڵی ئەم وتەیە، و پێچەوانەی ئەوەشە کە زانایان بڕیاریان داوە لەم باسەدا، بەڵکو پێچەوانەی ئەو دەقانەیە کە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کوفر هەندێکی توندتر و چڕترە لە هەندێکی تری.

(١) البغية المرتاد في الرد على المتلفسفة والقرامطة والباطنية (٣٤٥).

الله تعالی دەفەرموێت: {هُمْ لِلْكُفْرِ يَوْمَئِذٍ أَقْرَبُ مِنْهُمْ لِلإِيمَانِ} (آل عمران: ١٦٧) ، واتە: ئەوانە ئەو ڕۆژە لە كوفرەوە نزیكترن تا لە ئیمان. وە الله تعالی دەفەرموێت: {إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا ثُمَّ كَفَرُوا ثُمَّ آمَنُوا ثُمَّ كَفَرُوا ثُمَّ ازْدَادُوا كُفْرًا} (آل عمران: ٩٠) ، واتە: بەڕاستی ئەوانەی دوای باوەڕهێنان كافر بوون و لەوەودوا زیاتر ڕۆچوون لە كوفردا... ، وە الله تعالی دەفەرموێت: {الْأَعْرَابُ أَشَدُّ كُفْرًا وَنِفَاقًا} (التوبة: ٩٧) ، واتە: عەرەبە دەشتەكییەكانی دەرەوەی مەدینە، لەمەڕ بێ باوەڕیی و دوو ڕییەوە لە خەڵكانی تر سەرسەختترن.

سەبارەت بە بابەتی دووەم: كە پلەكانی وەستاوەكانە لە تەكفیركردنی موشریكەكان...

جا دەڵێین: لە وەستاوەكان لە موشریكەكان چەند پلەیەك هەیە كە هێزی بەڵگەی شەرعی تیایدا كاریگەری هەیە، وە هەروەها دەركەوتن و ئاشكرایی كوفر یان شیرك...

شێخی نوێكەرەوە محمد بن عبدالوهاب -رحمه الله- دەڵێت: "جا ئەو تاغوتانە كە خەڵك باوەڕی پێیانە لە (أهل الخرج) و جگە لەوانیش بەناوبانگن بەمە لە لای كەسی تایبەت و گشتی، وە ئەوان بۆی دەپاڵێون، و فەرمان دەكەن پێی بە خەڵكیی: هەموویان كافری هەڵگەڕاوەن لە ئیسلام، هەركەسێكیش مشتومڕ بكات دەربارەیان، یان ڕەخنە بگرێت و ناڕازی بێت لەو كەسەی تەكفیریان دەكات، یان وا بزانێت ئەم كارەیان ئەگەر باتڵیش بێت دەریان ناكات بۆ كوفر: كەمترین حاڵی ئەو كەسە مشتومڕكارە ئەوەیە فاسیقە، نووسراوەكانی لێ قبوڵ ناكرێت و ڕەتكراوەتەوە، وە بەهەمان شێوە شایەدی لێ وەرناگیرێت، و نوێژ لەدواوەی ناكرێت".[٢] وتەكەی كۆتایی هات -رحمه الله.-

جا سەرنج بدە وتەكەی؛ چۆن حاڵی وەستاوەكەی لەم تاغوتانەدا كردە چەند حاڵەتێك و كەمترینی فیسقە، ئەمەش ئەوە پشتڕاست دەكاتەوە كە بۆ وەستاوەكان لە موشریكەكان چەند حاڵەتێك و پلەیەك هەیە.

*ئەم پلە و ئاستانەش هێزی بەڵگە شەرعییەكە تیایدا كاریگەری هەیە، وە هەروەها دەركەوتن و ئاشكرایی كوفر یان شیرك بەبێ ڕەچاوكردنی چڕی و توندیەكەی؛ دەشێت شیرك لە بارێك لە بارەكان چڕترین بێت، بەڵام لە دەركەوتندا كەمترە و بەم ڕادەیە ئاشكرا نییە.

**نموونەی ئەمە:** شیركی بتپەرستەكان لەگەڵ شیركی جەهمیە؛ حوكمدان بە تەكفیركردنی وەستاو لە بتپەرستەكان بەهێزترە لە حوكمدان بە تەكفیركردنی وەستاو لە جەهمیە؛ ئەمەش لەبەرئەوەی پەرستنی بتەكان ئاشكراتر و دیارترە لە جەهمی بوون، لەگەڵ ئەوەی جەهمیەت شیركەكەی چڕتر و خەستترە.

(ابن القیم -رحمه الله-) دەڵێت: "بۆیە بەڕاستی موشریكێكی دانپیانەر بە سیفەتەكانی پەروەردگار باشترە لە یەكخەرێكی نكوڵیكەر لە سیفەتەكانی كەماڵی پەروەردگار... جا ئایا زەمكردن و تانەدان لە سیفەتەكانی كەماڵ و نكوڵی لێكردنیان لە كوێی پەرستنی هۆكارێكە (واسطة) لە نێوان پەرستراوی حەق و بەندە، كە پێی وایە

(٢) الدرر السنیة (٥٢/١٠).

خۆی نزیك دەكاتەوە لە پەرستنی ئەو هۆكارە و وەك گەورەكردن و بەرزكردنەوە بۆی؟ بـۆیە دەردی پەكخستن ئەو دەردە كوشندەیەیە كە دەرمانی نییە". [٣]

بە هەمان شێوە دەڵێت -رحمه الله-: "شیرکی بـتـپەرستان و ڕۆژ و مانگ و هەسارە پەرستەكان زۆر باشترە لە تەوحیدی ئەوانە، چونكە ئەوە شیركە لە ئولوهیەت لەگەڵ جێگیركردنی دروستكاری جیهـان و سـیفەتەكانی و كردارەكانی و توانا و ویستی و زانستی بە گشتییەكان و بەشەكان (الكليات والجزئيات)، وە تەوحیـدی ئەوانە پەكخسـتنی ڕبـوبیەت و ئولـوهیەت و تەواوی سـیفەتەكانیەتی، ئەم تەوحیـدەش پەیوەسـتە بە گەورەتـرین جۆرەكانی شیرك، بۆیە هەر كاتێك كەسێك گەورەترین پەكخستنی كـرد ئەوا گەورەتـرین شـیركی كـردووە". [٤]

وتەكەی كۆتایی هات -رحمه الله.-

بەپێی ئەوەی لە پێشدا باسكرا؛ ئێستا باسـی پلەكـانی وەسـتاوەكان لە موشریكەكـان یـان كـافران دەكەیـن بە گوێرەی ئاشكرایی و ناسراوی بەڵگەكان لەسەر كوفریان، پشتبەستوو بە دەقەكانی زانایان لەمەدا:

## پـلەی یەکەم- ئەوەی دەوەسـتێت لەو کەسـەی زانینـی کـوفرەکەی بە پێویست دانراوە، لە دینی گەل و نەتەوەکان، لەمانەش:

**یەكەم:** ئەو كەسەی دەوەستێت لە ئیبلیس یان فیرعەون یان كەسێك بانگەشەی خوایەتی بكات بـۆ خـۆی یـان بۆ جگە لە خۆی.

شـێخی ئیسـلام (ابـن تيميـة -رحمـه الله-) لە تەكفیركردنـی ئەو كەسـەی فیـرعەون تەكفیـر ناكـات دەڵێـت: "بەپێویستییەوە زانـراوە لە دینـی گەلەكـان؛ موسـڵمانان و جـوولەكە و نەسـارا: كە فیـرعەون لە بـێ بـاوەڕترین دروستكراو بووە بە الله". [٥] وتەكەی كۆتایی هات -رحمه الله.-

**دووەم:** ئەو كەسەی دەوەستێت لە بتپەرستان، ئەگەرچی بدرێنە پاڵ ئیسلام.

شێخی ئیسلام (ابن تيمية -رحمه الله-) لە تەكفیركردنی ئەوانەی بـتــپەرستن بەڕاسـت دادەنـێن دەڵێـت: "هەر كەسێكیش تەكفیریان نەكات ئەوا لە جوولەكە و نەسارا بێ باوەڕترە؛ چونكە جـوولەكە و نەسـارا بـتــپەرستان تەكفیر دەكەن". [٦] وتەكەی كۆتایی هات.

---

(٣) الداء والدواء (ص١٤٤).

(٤) مختصر الصواحق المرسلة(ص١٨٦).

(٥) مجموع الفتاوى (١٢٥/٢).

(٦) مجموع الفتاوى(١٢٨/٢).

(ابن الوزير الصنعاني -رحمه الله-) دەڵێت: "گومانی تێدا نییە کە ئەو کەسەی گومان بکات لە کوفری بتپەرست واجبە تەکفیر بکرێت، لەگەڵ ئەو کەسە کە تەکفیری ناکات، هیچ هۆیەکیش نییە لەمەدا تەنها ئەوە نەبێت کە زانینی کوفرەکەی بە پێویست دانراوە لە دیندا". [٧] وتەکەی کۆتایی هات.

حوکمی کەسی وەستاو لەم پلەیەدا کوفرە، و عوزری نەزانینی بۆ ناهێنرێتەوە لەمەدا بۆ هەر کەسێك بەڵگەی ڕیسالی پێگەیشتبێت.

## پلەی دووەم- ئەوەی دەوەستێت لەو کەسانەی زانینی کوفرەکەیان بە پێویست دانراوە لە دینی موسڵمانان بە تایبەت؛ وەك ئەو کەسەی دەوەستێت لە جوولەکە و نەسارا، یان هەر کەسێك کە واز لە دینی ئیسلام دێنێت.

(القاضي عياض -رحمه الله-) دەڵێت: "تەکفیری ئەو کەسە دەکەین کە تەکفیری ئەو کەسە ناکات پەیڕەوی جگە لە دینی موسڵمانان دەکات، یان دەوەستێت لێیان، یان گومان دەکات، یان ڕێگاکەیان بە ڕاست دادەنێت". [٨] وتەکەی کۆتایی هات.

شێخی ئیسلام (ابن تیمیة -رحمه الله-) دەڵێت: "وە هەر کەسێك دینداری حەڕام نەکات بە دینی جوولەکە و نەسارا دوای ناردنی پێغەمبەر (ﷺ)، بەڵکو ئەوەی تەکفیریان نەکات و ڕقی لێیان نەبێتەوە ئەوا موسڵمان نییە بە کۆڕای موسڵمانان". [٩] وتەکەی کۆتایی هات.

حوکمی وەستاو لەم پلەیەدا کوفرە، و عوزری نەزانینی بۆ ناهێنرێتەوە لەمەدا بۆ هەر کەسێك بەڵگەی ڕیسالی پێگەیشتبێت.

## پلەی سێیەم- ئەوەی دەوەستێت لەو کەسەی دەدرێتە پاڵ ئیسلام و کەوتۆتە نێو شیرکێك یان کوفرێك ئیجماع لەسەر کافربوونی ئەو کەسەیە کە دەکەوێتە ناویەوە، ئەمانەش لەسەر چەند پلەیەکن:

---

(٧) الروض الباسم (٢/٥٠٩).

(٨) الشفا بتعريف حقوق المصطفى (٢/٢٨٦).

(٩) مجموع الفتاوى(٢/١٣٢).

**یەکەم لە پلەی سێیەم:** ئەو کەسەی تەئویلی نییە؛ بۆیە یان دەمێنێتەوە لەسەر ڕوونکردنەوەی حاڵەکە بۆی، یان لەسەر ڕوونکردنەوەی حوکمی شەرع دەربارەیان، یاخود حاڵیان و حوکمی شەرع دەربارەیان ڕوون دەکرێتەوە بۆی، ئەمەش بەپێی ئاشکرایی شیرك و ئاشکرایی حاڵی کەسی وەستاو دەربارەیان؛ جا ئەگەر دوای ئەوە وەستا ئەوا کافرە، بەڵام ئەگەر هاتوو حاڵیان ئاشکرا و دیار بوو، و حوکمی شەرعیش دەربارەیان ئاشکرا و دیار بوو؛ ئەوا حوکم دەدرێت بە کافربوونی وەستاو بەبێ ڕوونکردنەوە.

شێخی ئیسلام (ابن تیمیة -رحمه الله-) لە دەربارەی کۆمەڵەیەك لە (الباطنیة)دا دەڵێت: "وە هەر کەسێك گومانی باشیان پێببات، و بانگەشەی ئەوە بکات حاڵیان نازانێت: حاڵیان زانراو و ناسراوە؛ بۆیە ئەگەر دانەبڕێت لێیان و نکوڵی و ڕەتکردنەوە دەرنەخات بۆیان ئەوا دەچێتە پاڵ ئەوان و دەبێتە یەکێك لەوان". [١٠]

وتەکەی کۆتایی هات.

*بڕوانە لێرەدا چۆن شێخی ئیسلام لە تەکفیری کەسی وەستاو لەم کۆمەڵەیە کورتی کردەوە لەسەر زانینی حاڵیان.

شێخ (سلیمان بن عبد الله -رحمهما الله-) لە دەربارەی هەندێك لە موڕتەدانی سەردەمەکەیدا دەڵێت: "جا ئەگەر گومانی هەبوو لە کوفرەکەیان یان کوفرەکەیانی نەدەزانی، بەڵگەکانی بۆ ڕوون دەکرێتەوە لە پەرتوکی الله و سوننەتی پێغەمبەرەکەی (ﷺ) لەسەر کوفرەکەیان، ئینجا ئەگەر هەر گومانی هەبوو دوای ئەمە یان دوودڵ بوو، ئەوا کافرە بە کۆڕای زانایان لەسەر ئەوەی: هەر کەسێك گومانی هەبێت لە کوفری کافر ئەوا کافرە". [١١]

وتەکەی کۆتایی هات -رحمه الله.-

*لێرەدا تێبینی ئەوە دەکەین شێخ سلیمان ڕوونکردنەوەی حوکمی شەرعی بە مەرج دانا بۆ وەستاو پێش تەکفیرکردنی.

(الإمام أبو حاتم الرازي -رحمه الله-) دەربارەی ئەو کەسەی دەڵێت قورئان مەخلوقە، دەڵێت: "هەر کەسێکیش گومان بکات لە کوفرەکەی لەو جۆرە کەسانەی تێدەگەن و دەزانن ئەوا کافرە، و هەر کەسێك نەزانێت ئەوا فێر دەکرێت؛ ئەگەر ملکەچ بوو بۆ حەق بە تەکفیرکردنی ئەوە تەواوە ئەگەرنا کافر دەبێت". [١٢]

وتەکەی کۆتایی هات -رحمه الله.-

*لەم نموونەیەشدا (أبو حاتم) فێرکردنی کەسی وەستاوی بە مەرج دانا بەر لە تەکفیرکردنی.

شێخی ئیسلام (ابن تیمیة -رحمه الله-) لە دەربارەی (الحلولیة) دەڵێت: "وە هەر کەسێك گومان بکات لە

(١٠) مجموع الفتاوی (١٣٢/٢).

(١١) الدرر السنیة (١٦٠/٨).

(١٢) طبقات الحنابلة(١٨٦/١).

کوفری ئەوانە دوای زانینی وتەیان و زانینی دینی ئیسلام ئەوا کافرە؛ هەروەك ئەو کەسەی گومان دەکات لە کوفری جوولەکە و نەسارا و موشریکەکان". [١٣] وتەکەی کۆتایی هات.

*لەم نموونەیەدا زانینی حاڵیان و حوکمی شەرعی بەیەکەوە بە مەرج دانا.

شێخی ئیسلام (ابن تيمية -رحمه الله-) لە دەربارەی "تائیفەی الدروز" دەڵێت: "کوفری ئەوانە لەو جۆرەیە کە موسڵمانان ناکۆکیان تیادا نییە؛ بەڵکو ئەوەی گومان بکات لە کوفریان ئەوا کافرە وەك ئەوان". [١٤] وتەکەی کۆتایی هات.

*لەم نموونەیەدا تێبینی دەکەین ڕوونکردنەوەی حاڵ و ڕوونکردنەوەی حوکمی نەکردە مەرج لە تەکفیرکردنی وەستاو؛ ئەمەش بەهۆی ئاشکرایی حاڵی ئەم کۆمەڵەیە، و ئاشکرایی بەڵگەکان لەسەر کوفریان.

**بەشی دووەم لە پلەی سێیەم:** ئەو کەسەی بنچینەی فاسیدی هەیە (أصول فاسدة) جا تەئویل دەکات؛ بۆیە لە حوکمدان لەسەری، زۆری ئاشکراییەکەی کوفری دیاریکراو یان کۆمەڵەکە کاریگەری هەیە، جا لە حاڵەتی ئاشکرایی کوفرەکە ئەوا بە کافرێکی یاخی لە قەڵەم دەدرێت کە خۆی داپۆشیوە بە تەئویلەکەی، وە لە حاڵەتی تردا جیاواز دەبێت لە نێوان تەفسیق و تەکفیرکردنی.

شێخی ئیسلام (ابن تيمية -رحمه الله-) لە دەربارەی کۆمەڵەیەك لە (الباطنية) دەڵێت: "سەبارەت بەو کەسەی دەڵێت: (بۆ قسەکەیان تەئویل هەیە و هاوڕێکە لەگەڵ شەریعەت)؛ ئەوا لە سەرانیان و پێشەوایانیانە؛ جا ئەگەر زیرەك بێت ئەوا دەزانێت درۆ دەکات لەوەی دەیڵێت، وە ئەگەر باوەڕی بەمە هەبێت لە ناخی و ڕواڵەتیدا ئەوا لە نەسارا بێ باوەڕترە؛ ئەو کەسەش کە تەکفیریان ناکات، و تەئویلێك بۆ قسەکەیان دەکات، ئەوا خۆی بە دوورتر دەگرێت لە تەکفیرکردنی نەسارا بەهۆی (التثليث والاتحاد)". [١٥]

بە هەمان شێوە دەڵێت: -رحمه الله-: "لەویەوە -واتە ئیمامی أحمد- لە دەربارەی تەکفیرکردنی ئەو کەسەی تەکفیریان ناکات دوو ڕیوایەت هەیە؛ -واتە لە تەکفیرکردنی ئەو کەسەی جەهمیە تەکفیر ناکات- ڕاست و دروستترینیان ئەوەیە تەکفیر ناکرێت". [١٦] وتەکەی کۆتایی هات.

ئیمامی بوخاری -رحمه الله- دەڵێت: "سەیری وتەکانی جوولەکە، و نەسارا، و مەجوسم کرد، کەسانێکم نەبینی گومڕاتر لە کوفرکردنەکەیان لەوان -واتە جەهمیە-، وە من ئەو کەسە بە نەزان دەزانم کە تەکفیریان ناکات، تەنها ئەو کەسە نەبێت کوفرەکەیان نازانێت". [١٧] وتەکەی کۆتایی هات -رحمه الله-.

---

(١٣) مجموع الفتاوى (٣٦٨/٢).

(١٤) مجموع الفتاوى (١٦٢/٣٥).

(١٥) مجموع الفتاوى (١٣٣/٢).

(١٦) مجموع الفتاوى (٤٨٦/١٢).

(١٧) مصدر السابق(٣٤/٢٤/٢).

ئەوەی دەردەکەوێت لە وتەی ئیمامی بوخاری، بۆ تەکفیر نەکردنی وەستاو لە جەهمیە چووە؛ وەك یەكێك لە دوو ڕیوایەتەکە لە ئیمام أحمد.

(المرداوي -رحمه الله-) وتویەتی : "ابن حامد لە ئوسوڵەکەی دا " شرح اصول الدين" باسی لە کوفری خەوارج و ڕافیزی و قەدەری و مورجئە کردووە، وە وتوویەتی: " هەر کەسێک ئەو کەسە کافر نەکات کە ئێمە کافرمان کردووە ئەوە تاوان بار " فاسق " بوە و دەبێت هجر بکرێت .( وە لە کفر کردنیدا دوو بۆچوون هەیە ) وە ئەوەی ئەو -ابن حامد- جگە لەمیش لە گێڕەوەکانی مەڕوذی ، و ئەبی تاڵیب و یەعقوب و جگە لەمانیش کە باسیان کردوە ئەوەیە کە کافر نابێت _ هەتاکوو وتویەتی : وە دەربارەی بیرو ڕای موعتەزیلە لە نکوڵی کردنی دەرهێنانی دڵی پێغەمبەر (ﷺ) وەگێڕانەوەی دڵی لە شەوی ئیسڕاء _شەو ڕەوی " دا فەرمویەتی : ئەم وتە و بیرو ڕایە لە دوو ڕووەوە کوفرە.

یەکەم : بەپێی ئەو بنەمایەی لە بیرو ڕای قەدەریەکاندا هەیە کە ( نەفی ) علم و زانستی الله دەکەن و نەفی ئەوەش دەکەن کە سیفەتی الله بیت، [کە ئەمەش ئەسڵو بنجینەیەکە لای موعتەزیلەکان کە دەڵێن الله شتەکان نازانێت تا ڕوونەدات. والعیاذ بالله].

دووەم : وە هەروەها ئەو قەولە کفرە کە هەر کەسێک بڵێت :ئەو کەسە کافر نابێت کە جەهمیە کافر ناکات[١٨]، [واتە بڵێت : ئەوکەسەی کافری پێ کافر نەبێت کافری ناکەین " ئاشکرایە کە ئەمەش کوفرە و لە هەڵوەشێنەرەوەکانی ئیسلامە]."

شیخ الإسلام ئیبن تەیمیە -رحمە الله- دەڵێت: سەبارەت بە پێشین و پێشەوایانی ئەم ئوممەتە ناکۆکی و ڕاجیاییان نەبووە لە بە کافر دانەنانی مورجیئە و شیعەی موفەزیلە -واتە ئەوانەی فەزڵی ئیمامی عەلی دەدەن بەسەر هەموو هاوەڵەکانی تردا بێ ئەوەی تانە و تەشەر لە هیچ هاوەڵێکی تر بدەن- و ئەوانەشی وەک ئەمانەن، وە جیاوازی نیە لە وتەکانی ئیمام ئەحمەد کە ئەوانە تەکفیر ناکرێن، وە ئەگەرچی هەندێک لەهاوەڵ و شوێنکەوتوانی مەزهەبی ئیمام ئەحمەد باسیان لە تەکفیرکردنی هەموو بیدعەچیەک [بیدعە لە عەقیدەدا والله اعلم] کردووە لە ئەمانەوە و جگە لەمانیش، بە پێچەوانەی بۆچونی ئیمام ئەحمەد یان بە پێچەوانەی ئەوەی کە لە مەزهەبەکەیدایە، تاوەکو هەندێکیان باسیان لەمانەوەی هاتە هەتایی ئەمانە و جگە لەمانیش کردووە لە جەهەننەمدا کە ئەمەش هەڵەیەکە بەسەر مەزهەبی ئیمام ئەحمەد و شەریعەتیشەوە"[١٩] وتەکەی کۆتایی هات -رحمه الله-.

---

(١٨) الإنصاف في معرفة الجراح من الخلاف(١٠/٣٢٤)-بتصرف يسير-.

(١٩) مجموع الفتاوى (٣/٣٥١).

**بەشی سێیەم لە پلەی سێیەم:** ئەو کەسەی بنەمای دروستی هەیە (أصول صحيحة) جا تەئویل دەکات؛ هەروەك هاتووە لە دەربارەی هەڵەی هەندێك صەحابە -رضي الله عنهم- لە دەربارەی تەکفیرکردنی هەندێك مورتەد؛ کاتێك الله تعالى هەڵەی ئەو کەسانەی ڕوون کردەوە کە وەستاون؛ و حوکمی نەدا بە کوفر لەسەریان.

لە (ابن عباس ـەوە -ڕەزای خوای پەروەردگاریان لێ بێت-) دەڵێت: "کۆمەڵێك لە خەڵکی مەککە هەبوون موسڵمان بوون، و ئیمانەکەیان شاردبووەوە، جا موشریکەکان لەگەڵ خۆیان هێنایانن لە ڕۆژی بەدر، ئینجا هەندێکیان برینداربوون و هەندێکیان کوژران، جا موسڵمانان وتیان: "ئەم موسڵمانانە هاوڕێمان بوون و زۆریان لێکرا بۆیە داوای لێخۆشبوونیان بۆ بکەن"، ئینجا ئەم ئایەتە دابەزی: {إِنَّ الَّذِينَ تَوَفَّاهُمُ الْمَلَائِكَةُ ظَالِمِي أَنفُسِهِمْ قَالُوا فِيمَ كُنتُمْ ۖ قَالُوا كُنَّا مُسْتَضْعَفِينَ فِي الْأَرْضِ ۚ قَالُوا أَلَمْ تَكُنْ أَرْضُ اللَّهِ وَاسِعَةً فَتُهَاجِرُوا فِيهَا ۚ فَأُولَٰئِكَ مَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ ۖ وَسَاءَتْ مَصِيرًا} (النساء: ٩٧) ، واتە: بەڕاستی ئەوانەی لە سەرە مەرگدا فریشتە گیانیان دەکێشن لە کاتێکدا ئەوان هەمیشە ستەمیان لە خۆیان دەکرد (ئیمان و باوەڕیان لە مەترسیدا بوو کەچی کۆچیان نەدەکرد بۆ نیشتمانی ئیمان، بەتوندی پیایاندا هەڵدەشاخێن) و دەڵێن: باشە ئێوە لە چیدا بوون و لە کوێ ژیانتان دەبردە سەر؟! لە وەڵامدا دەڵێن: ئێمە بێ دەسەڵات و لاواز کراو بووین لە زەویدا، فریشتەکان دەڵێن: باشە ئایا زەوی خوا فراوان نەبوو تا کۆچی تێدا بکەن (کۆچ بکەن بۆ نیشتمانێك کە ئیمانداران تیایدا فەرمانڕەوان یاخود سەربەستن) ئا ئەوانە جێگایان دۆزەخە، کە ئەویش چارەنووسێکی نالەبار و خراپە.

وتی: جا ئەم ئایەتەی نووسی بۆ ئەو موسڵمانانەی مابوون و هیجرەتیان نەکردبوو، و ئیتر هیچ عوزرێکیان نییە، وتی: جا موسڵمانەکان لە مەککە دەرچوون بۆ هیجرەت پاشان موشریکەکان شوێنیان کەوتن و پاشگەزیان کردنەوە لە ئیسلام، ئینجا ئەم ئایەتە دەربارەیان دابەزی: {وَمِنَ النَّاسِ مَن يَقُولُ آمَنَّا بِاللَّهِ} (العنكبوت: ١٠) تا کۆتایی ئایەتەکە.[٢٠]

شێخ (عبد الله بن محمد بن عبد الوهاب -رحمهم الله-) دەڵێت: "جا الله ئەم ئایەتەی دابەزاند، و تیایدا حوکمی ئەم موشریکانەی ڕوونکردەوە، و بوونە نیشتەجێی ئاگر سەرەڕای شەهادە هێنانیان".[٢١] وتەکەی کۆتایی هات.

گێڕدراوەتەوە لە صەحابەوە -رضي الله عنهم- ناکۆك بوون لە تەکفیرکردنی هەندێك مورتەد، جا کاتێك الله تعالى کوفری ئەو کۆمەڵەیەی ڕوونکردەوە فەرمانی نەکرد بەوەی وەستابوو لە تەکفیرکردنیان بە نوێکردنەوەی ئیسلامەکەی.

(٢٠) رواه الطبري في تفسيره (١٠٢/٩) بسند صحيح.

(٢١) الدرر السنية (٢٤١/١٠).

الله تعالى دەفەرموێت: {فَمَا لَكُمْ فِي الْمُنَافِقِينَ فِئَتَيْنِ وَاللَّهُ أَرْكَسَهُم بِمَا كَسَبُوا ۚ أَتُرِيدُونَ أَن تَهْدُوا مَنْ أَضَلَّ اللَّهُ ۖ وَمَن يُضْلِلِ اللَّهُ فَلَن تَجِدَ لَهُ سَبِيلًا} (النساء: ٨٨) واتە: جا ئەوە چیتانە (ئەی ئیمانداران) دەربارەی دووڕووەکان بوون بە دوو دەستەوە؟! لە کاتێکدا الله (سەر شۆڕی کردوون) و وەری گێڕاونەتەوە بۆ بێ باوەڕی بەهۆی ئەو کردەوانەی کە کردوویانە، ئایا دەتانەوێت (دڵی) کەسێك هیدایەت و ڕێنموویی بکەن کە الله گومڕای کردووە (بەهۆی باوەڕی دانەمەزراو و دڵ و دەروونی نەخۆشیەوە)، بێگومان ئەوەی الله گومڕای بکات ئەوە هەرگیز ڕێگەیەکت دەست ناکەوێت بۆ ڕێنموویی کردنی.

لە دەربارەی هۆکاری دابەزینیەوە بە صەحیحی هاتووە کە پێغەمبەر (ﷺ)دەرچوو بەرەو ئوحود، جا خەڵکێك گەڕانەوە لەوانەی لەگەڵیدا بوون، ئینجا هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) بوون بە دوو دەستە دەربارەیان، هەندێکیان وتیان: "دەیانکوژین"، هەندێکی تریان وتیان: "نەخێر". [٢٢]

لە موجاهید ـەوە -رحمه الله- بە صەحیحی هاتووە کە دەڵێت: "کۆمەڵێك لە مەککە دەرچوون تاوەکو گەیشتنە مەدینە خۆیان وا دەرخست کە موهاجیرن، پاشان مورتەد بوونەوە دوای ئەوە، جا مۆڵەتیان خواست لە پێغەمبەر (ﷺ) بۆ چوونەوە مەککە؛ بۆ ئەوەی هەندێك کەلوپەلیان بهێننەوە بازرگانی پێبکەن، جا ئیمانداران ناکۆك بوون دەربارەیان، هەندێکیان وتیان: "ئەوانە مونافیقن"، هەندێکیان وتیان: "ئەوانە ئیماندارن"، بۆیە الله دووڕووییەکەیانی دەرخست و ڕوونکردەوە، و فەرمانی کرد بە جەنگکردن لە دژیان". [٢٣]

لە (ابن عباس -رضي الله عنهما-) گێڕدراوەتەوە وتویەتی: "جا بەم شێوەیە بوونە دوو دەستە و پێغەمبەر لە لایان بوو نەهی نەکرد لە هیچ یەکێکیان لە دوو دەستەکە، ئینجا ئەم ئایەتە دابەزی: {فَمَا لَكُمْ فِي الْمُنَافِقِينَ فِئَتَيْنِ} (النساء: ٨٨) تا کۆتایی ئایەتەکە". [٢٤]

ئیمامی (الطبري -رحمه الله-) لە تەفسیری ئەم فەرموودەیەی الله تعالى: {فَمَا لَكُمْ فِي الْمُنَافِقِينَ فِئَتَيْنِ وَاللَّهُ أَرْكَسَهُم بِمَا كَسَبُوا} (النساء: ٨٨)، دەڵێت: "واتە بەهۆی ئەمەوە: الله گەڕاندنیەوە بۆ حوکمەکانی موشریکەکان لە حەڵاڵ کردنی خوێنیان، و بە کەنیزەکردنی نەوەکانیان". [٢٥] وتەکەی کۆتایی هات.

ئیمامی (الطبري) وای بە ڕاجح داناوە کە ئەم ئایەتە دەربارەی کۆمەڵێك دابەزی هەڵگەڕابوونەوە لە ئیسلام، کاتێك دوای ئەوەی باسی وتەکانی سەلەف دەکات لە هۆکاری دابەزینی، دەڵێت: "وە لە پێشترین وتە بە ڕاستی و دروستی لەم وتانەدا لە دەربارەی ئەمە: ئەو وتەیەی دەڵێت: ئەم ئایەتە سەبارەت بە ناکۆکی هاوەڵانی رسول الله (ﷺ) دابەزی دەربارەی کۆمەڵێك لە خەڵکی مەککە کە هەڵگەڕابوونەوە لە ئیسلام دوای موسڵمان

---

(٢٢) متفق عليه ، صحيح البخاري(١٣٩٩/١٠٥/٢)،صحيح مسلم (٧٨١/٥/٢).

(٢٣) رواه الطبري في تفسيره (١٠٠٥٢/٩/٨)بسند صحيح.

(٢٤) تفسير الطبري (٨ظ١٠ظ١٠٠٥٤).

(٢٥) تفسير الطبري(٧/٨).

بوونیان". [٢٦] وتەکەی کۆتایی هات.

(ابن أبي زمنين -رحمه الله-) دەڵێت: " ئەوان کۆمەڵێك بوون لە مونافیقەکان لە مەدینە بوون؛ جا لەوێ دەرچوون بەرەو مەککە، پاشان لە مەککە دەرچوون بۆ یەمامە بە بازرگانی بۆیە هەڵگەڕانەوە لە ئیسلام، و ئەوەی هەبوو لە شیرك لە دڵیان دەریانخست، جا موسڵمانان پێیان گەیشتن، و بوونە دوو دەستە دەربارەیان؛ ئینجا هەندێکیان وتیان: خوێنیان حەڵاڵ بوو، ئەوانە موشریکی مورتەدن، وە هەندێکیان وتیان: خوێنیان حەڵاڵ نەبووە؛ ئەوانە کەسانێکن دووچاری فیتنە بوونەتەوە، بۆیە الله تعالی فەرمووی: {فَمَا لَكُمْ فِي الْمُنَافِقِينَ فِئَتَيْنِ}". [٢٧] وتەکەی کۆتایی هات -رحمه الله-.

بە هەمان شێوە لە بەڵگەکان ئەوەیە: کۆمەڵێك لە زانایان بە ڕاجحیان داناوە کە (عمر بن الخطاب -رضي الله عنه-) وەستا لە تەکفیرکردنی زەکاتنەدەرەکان لە سەرەتای ڕووداوەکە، کاتێك ئیمامی ئەبو بەکر -رضي الله عنه- کوفرەکەیانی بۆ ڕوون کردەوە، ئینجا پەسەندی ئەوی کرد، وە داوای تەوبەی لێنەکرا لەسەر وەستانی دەربارەیان؛ بە صەحیحی لەئیمامی عمر -رضي الله عنه- هاتووە کە بە ئیمامی ئەبو بەکری وت -رضي الله عنه- لە دەربارەی "مورتەدان" :چۆن دەجەنگی لەگەڵ ئەو خەڵکە؟ لە کاتێکدا پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: "أمرت أن أقاتل الناس حتى يقولوا لا إله إلا الله، فمن قالها فقد عصم مني ماله ونفسه إلا بحقه، وحسابه على الله". [٢٨] واتە: فەرمانم پێکراوە بجەنگم لەگەڵ خەڵك تاوەکو دەڵێن لا إله إلا الله، جا هەر کەسێك بیڵێت ئەوا ماڵ و سامانی و خۆیشی لە من حەڕام و پارێزراو دەبێت، وە لێپرسینەوەی لەسەر الله ـیە.

حوکمدان لەم حاڵەتەدا ئەوەیە: لە سەرەتادا کەسی وەستاو تەکفیر ناکرێت، بەڵکو حوکم دەدرێت لەسەری بەوەی هەڵەی کردووە، ئەم حوکمەش لەسەر ئەوە بنیاتنراوە کە تەکفیر لە حوکمە شەرعییەکانە، وە حوکمی موجتەهیدی بەهەڵەداچوو تیایدا وەك حوکمی ئەو کەسەیە کە هەڵە دەکات لە بابەتە شەرعییەکان، جا کاتێك بەڵگەکانی بۆ ڕوونکرایەوە و تەئویلەکەی پچڕێنرا پاشان دوای ئەوە وەستا ئەوا کافرە.

شێخی ئیسلام (ابن تيمیه -رحمه الله-) دەڵێت: "باوەڕبوون بە واجبوونی واجبە ئاشکرایە متواترەکان و بە حەڕامبوونی حەڕامکراوە ئاشکرایە متواترەکان: لە گەورەترین بنەماکانی ئیمان و ڕێساکانی دینە و کەسی نکوڵیکەر و ڕەتکەرەوەیان کافرە بە کۆڕا لەگەڵ ئەوەی ئەو کەسەی ئیجتیهاد دەکات لە هەندێکیان، کافر نییە بە کۆڕا سەرەڕای هەڵەکردنی". [٢٩] وتەکەی کۆتایی هات -رحمه الله-.

(٢٦) تفسير الطبري (١٣/٨).
(٢٧) تفسير القرآن العزيز لابن أبي زمنين(٣٩٣/١).
(٢٨) متفق عليه ، صحيح البخاري (١٨٨٤/٢٢/٣)، صحيح مسلم(٧١٣٢/١٢١/٨).
(٢٩) مجموع الفتاوى (٤٩٦/١٢).

شێخ (سلیمان بن سحمان -رحمه الله-) دەڵێت: "پاشان قەدەری الله ئەگەر یەکێك لە زانایان وەستا لە تەکفیرکردنی یەکێك لەم نەزانە لاساییکەرەوانەی جەهمیە، یان نەزانە لاساییکەرەوانەی گۆڕپەرستەکان، دەکرێت عوزری بۆ بهێنینەوە بەوەی هەڵەکارێکی خاوەن عوزرە، نالێین کوفری کردووە بەهۆی پارێزراو نەبوونی لە هەڵە، ئیجماعیش لەمەدا براوەتەوە". [٣٠] وتەکەی کۆتایی هات.

## پلەی چوارەم- ئەوەی دەوەستێت لەو کەسەی دەکەوێتە نێو کوفرێك یان شیرکێك، وە هۆکاری وەستانەکەشی مەبەستێکی شەرعی ڕێگەپێدراوە، لەمانەش:

١- ئەوەی دەوەستێت لەو کەسەی کەوتۆتە جۆرێك شیرك یان کوفر جیاوازی تێدا هەیە لەوەی لە دین دەرچوێنەر بێت؛ وەك وازهێنان لە نوێژ.

٢-وە هەروەها ئەوەی دەوەستێت لەو کەسەی دەدرێتە پاڵ زانستی شەرعی بە مەبەستی دوورخستنەوە و وەلانانی تەکفیر لە زانایانی موسڵمانان.

حوکمی وەستاو لەم دوو نموونەیەدا ئەوەیە کە موجتەهیدێکی پاداشتدراوە بە ئیزنی الله؛ ئەگەر پێکای ئەوا دوو پاداشتی بۆ هەیە، وە ئەگەر هەڵەی کرد ئەوا پاداشتێکی بۆ هەیە.

شێخی ئیسلام (ابن تیمیە -رحمه الله-) دەڵێت: "لابردن و دوورخستنەوەی تەکفیر لە زانایانی موسڵمانان ئەگەرچی هەڵەشیان کرد ئەوا لە گرنگترین مەبەستە شەرعییەکانە؛ تەنانەت گریان دوورخستنەوەی تەکفیر لەو کەسەی قسەکەی کردووە بڕوای وابێت کە کافر نییە وەك پارێزگارییەك لێی، و سەرخستنی برا موسڵمانەکەی؛ ئەو کاتە ئەمە مەبەستێکی شەرعی چاکە، ئەگەر ئیجتیهادی کرد لەمەدا و پێکای ئەوا دوو پاداشتی بۆ هەیە، ئەگەر ئیجتیهادی کرد تیایدا و هەڵەی کرد ئەوا پاداشتێکی بۆ هەیە". [٣١] وتەکەی کۆتایی هات.

**لێرەدا پرسیارێکی گرنگ دێتە پێش، کە ئەویش: ئایا پلەی کەسی وەستاو لە گۆڕپەرستەکان لە کوێی ئەم پلە و ئاستانەدایە؟**

* وەڵامەکەش بریتییە لەوەی پلەی وەستاو لە قبورییەکان (گۆڕپەرستەکان) جیاواز دەبێت بەپێی دەرکەوتن و ئاشکرایی شیرکەکە یان باوەڕبوون بە مردووەکە، گومانی تێدا نییە کە هەیانە هاوشێوەی پەرستنی بتەکانە یان

---

(٣٠) کشف الأوهام والالتباس(ص٧٠).

(٣١) مجموع الفتاوى (١٠٣/٣٥).

زیاتریش، وە هەیانە لە خوارترە و وەك ئەمە نییە، وە هەیانە دەبێتە هۆی داهێنان لە دیندا (الابتـداع) و ناگـاتە شیرك.

شێخی ئیسلام (ابن تیمیة -رحمە اللە-) دەڵێت: "پلەکان لەم بابەتەدا سێیانە:

یەکەمیان: ئەوەیە هاواری جگە لە اللە بکات کە مردوویکە یان کەسی ئامـادەنەبووە (غائـب)، جـا یەکسـانە لە پێغەمبەران و پیاوچاکان بێت یان جگە لەوان ئینجا دەڵێت: ئەی گەورەم فلأن فریام بکەوە، یان خۆم بە تۆ پەنا دەدەم، یان هانام بۆ هێناویت، یان سەرم بخە بەسەر دوژمنەکەم، هاوشێوەی ئەمانە ئەوا هاوبەش بریـاردانە بـۆ اللە...

لەمەش گەورەتر ئەوەیە دەڵێت: لێم خۆشبە و تەوبەم لێ وەربگرە؛ هەروەك کۆمەڵەیەك لە موشریکە نەزانەکـان دەیکەن..

لەمەش گەورەتر: ئەوەیە سـوجدە بـۆ گـۆڕەکەی ببـات و نـوێژ لەلای بکـات، وا ببینێـت نـوێژکردن باشـترە لە ڕووکردنە قیبلە، تەنانەت هەندێکیان دەڵێن: ئەمە قبلەی تایبەتەکانە، و کەعبەش قیبلەی عەوامە..

لەمەش گەورەتر: پێی وابێت گەشت کردن بۆ لای لە ڕەگەزی حەج ـە، تەنانەت دەڵێت: (چەند جارێك گەشت کردن بۆ لای هاوشێوەی حەجێکە)، زیادەڕۆکانیان دەڵێن: (جارێك سەردانی کردنی چاکترە بە حەجی مـاڵەکە -کەعبە- بە چەندین جار)، وە هاوشـێوەی ئەمـانە: ئەمە هـاوبەش بڕیـاردانە، ئەگەرچـی زۆرێـك لە خەڵکیـی تێیدەکەون لە هەندێکی..

دووەم: ئەگەر بە مردووەکە یان ئامـادەنەبووەکە لە پێغەمـبەران و پیاوچاکـان بڵێـت: دوعـام بـۆ بـکە لەلای اللە، یـان دوعامان بۆ بکە لە لای پەروەردگار، یـان داوامـان بـۆ بـکە لە لای اللە؛ هەروەك نەسـارا بە مەریەم و جـگە لەویـش دەڵێن؛ بە هەمان شێوە هیچ زانایەك گومانی لێ نییە کە جائیز نییە، و لەو بیدعانەیە هیچ یەکێـك لە پێشـینی ئـوممەت نەیکردووە...

بۆیە بزانە دروست نییە داوای هیچ شتێك لە مردوو بکرێت: نابێت داوای لێ بکـات دوعـا بکـات لە لای اللە بـۆی و جگە لەمەش، وە دروست نییە سکاڵای هیچ شتێك بکات لە لای لە ناخۆشی و بەڵاکـانی دونیـا و دیــن؛ ئەگەرچـی دروستە سکاڵا بکرێت لە لای لە ژیانیدا؛ چونکە لەم مـاوەیەی لە ژیانیـدایە نایبـات بەرەو شـیرك، بەڵام ئەمە دەبێـتە هۆی شیرك..

سێیەم: ئەوەیە بڵێت: داوات لێ دەکەم بە فلان یـان بە خـاتری فـلان لەلات و هاوشـێوەی ئەمە لە (أبي حنیفـة وأبـی یوسف) و جگە لەوانیش گێڕدراوەتەوە کە نەهی لێکراوە". [٣٢] وتەکەی کۆتایی هات -رحمە اللە-.

بەم ئەندازەیە دێینە کۆتایی، وە داوای سەرکەوتوویی و پشتیوانی و پێکان لە اللە تعالی دەکەین، وصلی اللە علی عبدە ورسولە محمد وعلی آلە وصحبە أجمعین.

(٣٢) مجموع الفتاوی (١/٣٥٠)-بتصرف-.

# ئەڵقەی پێنجەم:

الحمد لله رب العالمين، والعاقبة للمتقين، ولا عدوان إلا على الظالمين، وأشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له، الملك الحق المبين، وأشهد أن محمداً عبده ورسوله إمام الأولين والآخِرين، أما بعد:

لەم ئەڵقەیەدا بە ئیزنی الله تعالى دەربارەی ئەو بابەتانەی ناکۆکی و ململانێی تیادا ڕوویدا دەربارەی حوکمی کۆمەڵەی ڕەتکەرەوەی (الطائفة الممتنعة) دروشم و حوکمەکانی ئیسلام.

## بەر لە چوونە نێو بابەتی کۆمەڵەی ڕەتکەرەوە، دەست دەکەین بە پێشەکییەکی کورت، جا دەڵێین:

ئەهلی سوننە و جەماعە ڕێککەوتوون لەسەر ئەوەی ئیمان بریتییە لە وتە و کردار، و لە زیاتر لە زانایەکەوە ئیجماع نەقڵ کراوە لەسەر ئەمە، و وردەکاری ئەم وتەیەش ئەوەیە کە شێخی ئیسلام (ابن تيمية -رحمه الله-) باسی کردووە و دەڵێت: "لە بنەماکانی ئەهلی سوننە ئەوەیە دین و ئیمان وتە و کردارە؛ وتەی دڵ و زمان و کرداری دڵ و زمان و ئەندامەکان". وتەکەی کۆتایی هات.

ڕوونکردنەوەی زیاتری ئەمە بریتییە لەوەی الله تعالى فەرمانی کردووە بە نوێژکردن و زەکاتدان و جگە لەمانەش، پایەی ئیمانیش بۆ فەرمانی الله تعالى بریتییە لە ملکەچ و گوێڕایەڵ بوون بۆی و ئەمەش لە کرداری دڵە، هەر کەسێکیش ملکەچ بوون لە دڵیدا نەبێت بۆ فەرمانی الله تعالى ئەوا کافرە، شێخی ئیسلام (ابن تيمية -رحمه الله-) دەڵێت: "زانراوە و ئاشکرایە کە ئیمان دانپێدانانە نەك تەنها بەڕاستدانان، دانپێدانانیش لە چوارچێوەی وتەی دڵ کە بریتییە لە بەڕاستدانان، و کرداری دڵیش کە بریتییە لە ملکەچ بوون"، تاوەکو دەڵێت: "جا هەر کەسێك لە دڵیدا بەڕاستدانان و ملکەچ بوونی تیادا نەبێت ئەوا کافرە". وتەکەی کۆتایی هات -رحمه الله-.

هەروەها پێویستە ئاگاداربین لە بابەتێکی گرنگ؛ کە بریتییە لەوەی ملکەچ بوونی دڵ بۆ فەرمانی الله تعالى هەر دەبێت شوێنەواری دەربکەوێت لەسەر ئەندامەکان، بۆیە هەر کەسێك کرداری ڕەتکردەوە، ڕەتکردنەوەکەی بەڵگەیە لەسەر نەبوونی ئیمانی و ملکەچ نەبوونی یان لاوازی ئیمانی و ملکەچ بوونەکەی، ئەو کەسەی کردار ناکات و ڕەتی دەکاتەوە یان ئەوەتا کافرە یان فاسیقە، ئەمەش جیاواز دەبێت بە جیاوازی وێنەی ڕەتکردنەوە و نەکردنی کردارەکە.

شێخی ئیسلام (ابن تيمية -رحمه الله-) دەڵێت: "بنچینەی ئیمان لە دڵدا؛ بریتییە لە وتە و کرداری دڵ؛ کە

بـریتییە لە دانپێـدانان بە بەڕاسـتدانان و خۆشەویسـتی و ملـكەچ بـوون، ئەوەشـی لە دڵە دەبێـت هانـدان و پێویستییەكانی دەربكەوێت لەسەر ئەندامەكان، ئەگەر كارنەكات بە پێویسـتییەكانی بەڵـگەیە لەسـەر نەبـوونی یان لاوازی "، وتەكەی كۆتایی هات.

مەبەسـت لەمەدا ئەوەیە ئینسـان كاتێـك كردارێـك لە كردارەكـانی ئیسـلام ناكـات و ڕەتـی دەكـاتەوە بە خۆگەورەزانینەوە ئەوا بە كافر لە قەڵەم دەدرێت بەهۆی ملكەچ نەبـوونی، كـوفری ئەو كەسـەش وەك كـوفری ئیبلیسە كە ڕەتی كردەوە سوجدە ببات بۆ ئـادەم -علیه السلام- ئەگەرچی دانبنێت بە واجب بوونی.

## دەگەڕێینەوە بۆ بابەتی كـۆمەڵەی ڕەتـكەرەوە و دەڵێـین: ئایا كـۆمەڵەی ڕەتكەرەوە (الطائفة الممتنعة) چییە؟

وەڵام: كۆمەڵەیەكن دێنە ناو ئیسلام پاشان بە هێز و جەنگكردن ڕەتی دەكەنەوە پابەنـدی فەرزێك و دانراوێـك بن لە دانراوە ئاشكرایە متواترەكانی ئیسلام، ئەگەرچی دانبنێت بە واجب بوونی.

بۆ نموونە: كۆمەڵەیەك ڕەتی بكەنەوە پابەندبن بە زەكات دان یان پابەندبن بە ڕۆژووگـرتن یـان جـگە لەمـانە لە فەڕزەكـانی ئیسـلام، هەرچەنـدە دانبنـێن بە واجـب بـوونی، یـاخود پابەندنـەبن بە وازهێنـان لە حەڕامكـراوە ئاشكراكان وەك ڕیبا و ئارەق و زینا، هەرچەندە دانبنێن بە حەڕام بوونیان، وە توانامان نەبێت پابەندیان بكەیـن تەنها بە جەنگ نەبێت، یـان دەبـنە خـاوەن هێزێـك و بەهـۆیەوە ڕەتـی دەكەنەوە پابەنـدبن بە فەرز و دانـراوە ئاشكراكان هەرچەندە بە كرداریش جەنگیان بەرپا نەكردبێت.

## پاشان دەڵێین: ئایا حوكمی كۆمەڵەی ڕەتكەرەوە چییە ؟

وەڵام: حوكمی كۆمەڵەی ڕەتكەرەوە لەسەر وتەی ڕاست و دروست لە وتەكانی زانایان بریتییە لە هەڵـگەڕانەوە (الردة)، و دەرچوون لە ئیسلام، ئەمەش بەپێی ئەوەی لە پێشدا باسكرا لە پێشـەكییەكە دەربـارەی پێكهـاتەی ئیمان، كە وتە و كردارە، و پێویستە ملكەچ و گوێڕایەڵ بوون هەبێت بۆ فەرمانەكانی الله تعالى.

بەڵـگەش لەسـەر ئەمە: ئیجماعـی صـەحابەیە -رضي الله عـنهم- بە پشتبەسـتوو بە بەڵـگەكە، وە زەكـات نەدەرەكانیان بە مورتەد ناوزەند كرد.

(أبو عبيدٍ القاسم ابن سلام) دەڵێت: "بەڕاستخەرەوە بۆ ئەمە جیهادی (أبي بكر الصديق -رضي الله عنـه-) بـوو لەگەڵ موهاجیرەكان و پشـتیوانان لەسـەر زەكـات نەدان لە لایەن عەرەب، وەك جیهـادی رسـول الله (ﷺ) لە

دژی موشریکەکان وەك یەکە، جیاوازیان نییە لە ڕشتنی خوێن، و بە کەنیزەکردنی نەوەکان، و بە غەنیمەت گرتنی سەروەت و سامان، کە ئەوان زەکاتدانیان ڕەتکردەوە لە هەمان کاتدا نکوڵیان لێ نەدەکرد"، وتەکەی کۆتایی هات.

شێخی ئیسلام (ابن تيمية -رحمه الله-) دەڵێت: "صەحابە و پێشەوایان لە دوایان لەسەر جەنگکردن دژی زەکات نەدەرەکان هەرچەندە پێنج نوێژەکەش بکەن، و مانگی ڕەمەزان بە ڕۆژوو ببن، وە ئەوانە شوبهەیەکی شیاویان نەبوو، بۆیە مورتەد بوون، وە دەجەنگان بۆ ئەوەی زەکاتەکە نەدەن، هەرچەندە دانیاندەنا بە واجب بوونی هەروەك الله فەرمانی پێکردووە"، وتەکەی کۆتایی هات.

شێخ (محمد بن عبدالوهاب) دوای نەقڵکردنی وتەی شێخی ئیسلام دەڵێت: "سەرنج بدە وتەکەی و لێدوانەکەی بەوەی کۆمەڵەی ڕەتکەرەوە بۆ زەکاتدان بە ئیمام دەجەنگان، و حوکمیان بەسەر دەدرێت بە کوفر، و هەڵگەڕانەوە لە ئیسلام، و نەوەکانیان دەکرێنە کەنیزەك، و سەروەت و سامانیان بە غەنیمەت دەگیرێت، هەرچەندە دانبنێن بە واجب بوونی زەکات، و پێنج نوێژەکەش بکەن، و هەموو فەرزەکانی ئیسلام جێبەجێ بکەن جگە لە زەکاتدان، وە ئەمەش نابێتە هۆی پەکخستنی جەنگ لە دژیان، و حوکمدان بە کوفر و ڕیدە لەسەریان، بەڕاستی ئەمەش بە قورئان و سوننەت، و کۆڕای صەحابە -رضي الله عنهم- چەسپاوە، والله اعلم"، وتەکەی کۆتایی هات.

## حوكمی جەنگكردن لە دژی كۆمەڵەی ڕەتكەرەوە.

قورئان و سوننەت و ئیجماع بەڵگەن لەسەر واجب بوونی جەنگکردن لە دژی کۆمەڵەی ڕەتکەرەوە.

الله تعالی دەفەرموێت: {وَقَاتِلُوهُمْ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ الدِّينُ كُلُّهُ لِلَّهِ} (الأنفال: ٣٩) ، واتە: (ئەی ئیمانداران) ئێوەش بجەنگن دژ بە کافر و خوانەناسان تا کوفر و شیرك نەمێنێت، و دینداری هەر بۆ الله بێت.

بۆیە ئەگەر هەندێك لە دین بۆ الله بێت، و هەندێکی تریش بۆ جگە لە الله بێت: جەنگ بەرپاکردن واجب دەبێت تاوەکو دین هەمووی بۆ الله دەبێت.

لە دوو صەحیحەکەوە هاتووە لە (ابن عمر -ەوە -رضي الله عنه-)، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: " أمرت أن أقاتل الناس حتى يشهدوا أن لا إله إلا الله ، وأن محمدا رسول الله ، ويقيموا الصلاة ، ويؤتوا الزكاة ، فإذا فعلوا ذلك ، عصموا مني دماءهم وأموالهم ، إلا بحق الإسلام ، وحسابهم على الله تعالى". واتە: فەرمانم پێکراوە بجەنگم لەگەڵ خەڵك تاوەکو شایەدی دەدەن بەوەی هیچ پەرستراوێك نییە بە حەق جگە لە الله و محمد پێغەمبەری خوایە، و نوێژ دەکەن، و زەکات دەدەن، ئەگەر ئەمانەیان ئەنجامدا ئەوا خوێنیان و ماڵ و سامانیان

حەرام و پارێزراو دەبێت لێم تەنها بە حەقی ئیسلام نەبێت، وە لێپرسینەوەیان لەسەر الله تعالى یـە.
ئیمامی ئەبو بەکر -رضي الله عنه- وتی: زەکات حەقێکە لە سەروەت و سامان، والله ئەگەر ئەو کـار و بەرخەی کە دەیاندا بە پێغەمبەر (ﷺ) پێم نەدەن، جەنگیان لەگەڵ دەکەم لەسەر ڕەتکردنەوەکەیان."
شێخی ئیسلام (ابن تیمیة -رحمه الله-) دەڵێت: "زانایان کۆکن لەسەر ئەوەی کـۆمەڵەی ڕەتـکەرەوە بـۆ فەڕز و حوکمێکی متواتر لە فەڕز و حوکمەکانی ئیسلام، واجبە جەنگی لەگەڵدا بکرێت تاوەکو دیـن هەمـووی بـۆ الله دەبێت، وەك شەڕخوازەکان و لەپێشتریشە."
بە هەمان شێوە دەڵێت -رحمه الله-: "زانراوە کە تەنهـا دەسـتگرتن بە ئیسـلام لەگەڵ پابەنـد نەبـوون بە فەڕز و حوکمەکانی، پەکخەری جەنگ نییە، جەنگکردن واجبە تاوەکو دیـن هەمووی بۆ الله دەبێت، و تـاوەکو شـیرك و کوفر کۆتایی پێبێت و نەمێنێت، جا هەر کاتێك دیـن بۆ جگە لە الله بوو ئەوا جەنگکردن واجـب دەبێـت، وە هەر کۆمەڵەیەکیش هەندێك لە نوێژە فەڕزەکان یان ڕۆژووگرتن یان حەج ئەنجـام نەدات و یـان ڕەتـی بکـاتەوە پابەند بێت بە حەڕام بوونی خوێن، و سەروەت و سامان، و ئاڕەق، و زینا، و قومار یان مارەکردنی مەحرەمەکان یان ڕەتی بکاتەوە پابەنـد بێـت بە جیهـادکردن لە دژی کـافران یـان دانـانی سـەرانە (جزیـة) لەسـەر خـاوەن کتێبەکان، وە جگە لەمانەش لە واجبەکانی دیــن، و حەڕامکراوەکانی کە عوزر بۆ هیچ کەسێك نییە لە نکـوڵی و ڕەتکردنەوەیان و وازلێهێنانیان، وە نکوڵیکەر لە واجببوونیـان تەکفیـر دەکرێـت، بـۆیە کـۆمەڵەی ڕەتـکەرەوە جەنگی لەگەڵ دەکرێت لەسەر ئەمە، هەرچەندە دانیان پێدابنێت، ئەمەش لەو جۆرانەیە کە نەمزانیـوە نـاکۆکی تیادا بێت لە نێوان زانایان"، وتەکەی کۆتایی هات -رحمه الله.-
بۆیە ئەگەر ئەمە حوکمی کۆمەڵەکە بێت کاتێك ڕەتی دەکاتەوە و ڕازی نابێت پابەند ببێـت بە فەڕز و حوکمێـك لە فەڕز و حوکمەکانی ئیسلام ئەی ئەوکاتە چۆن دەبێت ئەگەر زیاتر لەمە ڕەت بکـاتەوە، بەڵکـو دەبێـت چـۆن بێت بۆ ئەو کەسەی ڕایگەیاندووە پابەند نابێت بە شەرعی الله لە ڕێـگەی گـۆڕینی بە قانونەکـانی دیموکراسـی یان بنەما و دانراوە دەستکردەکان؟!

**کاتێك ئەمە بڕیاردراوە و جێگیربووە، پێویستیشە ئاگاداربین لە چەند بابەتێك:**

## بابەتی یەکەم: ئەو نـاکۆکیەی ڕوویـدا لە نێـوان زانایـانی صـەحابە: ئەبـی بەکـر و عمـر دەربـارەی تەکفیرکردنـی کـۆمەڵەی ڕەتـکەرەوە (الطائفـة الممتنعة).

ئەو نـاکۆکیەی دروسـتبوو لە نێـوان صـەحابە لە دەربـارەی تەکفیرکردنـی زەکـات نەدەرەکـان لە سـەرەتای ڕووداوەکە جێگیر و چەسپاوە بە دەقی ئەو فەرمـوودەیەی ئیمـامی بوخـاری و موسـلیم گێڕاویەتیـانەوە لە (أبي

هريرة ـەوە -رضي الله عنه-) دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر (ﷺ) وەفاتی کـرد، ئەبـو بەکـر بـووە جێنشـینی لە دوای خۆی، وە ئەوەی کافربوو لە عەرەب کافربوو، ئیمامی عمر بە ئیمامی ئەبی بەکری وت: چـۆن دەجەنگـی لەگەڵ ئەم خەڵکە لە کاتێکدا پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (فەرمانم پێکراوە بجەنگم لەگەڵ خەڵـك تـاوەکو شـایەدی دەدەن بەوەی هیچ پەرستراوێك نییە بە حەق جگە لە الله و محمد پێغەمبەری خوایە، و نوێژ دەکەن، و زەکـات دەدەن، ئەگەر ئەمانەیان ئەنجامدا ئەوا خوێنیان و ماڵ و سامانیان حەڕام و پارێزراو دەبێت لێم تەنها بە حەقی ئیسلام نەبێت، وە لێپرسینەوەیان لەسەر الله تعالى يـه) جا وتی: والله دەجەنگم لەگەڵ ئەو کەسـەی جیـاوازی دەکات لە نێوان نوێژ و زەکات، چونکە زەکاتیش حەقێکە لە ماڵ و سـامان، والله ئەگەر پـەتێك کە دەیانـدا بە پێغەمبەر (ﷺ) پێمی نەدەن، جەنگیان لەگەڵ دەکەم لەسەر ڕەتکردنەوەی، جـا ئیمامـی عمـر وتـی: والله تەنهـا وای دەبینم الله سینەی ئەبی بەکری ساف و فراوان کردووە بۆ جەنگکردن بۆیە زانیم لەسەر حەقە."

جا بەڵگەهێنانەوەی ئیمامی عمر -رضي الله عنه- لەسەر حەڕامێتـی جەنگکـردن بەوەی دەڵـێن لا إلـه إلا الله، بەڵگەیەکی ڕوون و ئاشکرایە لەسەر ئەوەی کوفری ئەوانی نەبینیبوو.

لەوانەی باسی لە ڕووداني ئەم ناکۆکیە لە نێو صەحابە کردووە، ئیمام (ابن قدامة)ـیە لە کیتابەکەیـدا (المُغنـي)، جا دوای ئەوەی باسی دوو ڕیوایەتەکە دەکات لە تەکفیرکردنی زەکـات نەدەرەکـان، دەڵێـت: "وە ڕووی یەکەم ئەوەیە عمر و جگە لەویش لە صـەحابە جەنگکردنیـان ڕەتکـردەوە لە سـەرەتای ڕووداوەکە، ئەگەر بڕوایـان وا بووایە کە کوفریان کردووە ئەوا لێیان نەدەوەستان..." تاوەکو کۆتایی وتەکەی -رحمه الله-.

## بابەتی دووەم: باسکردنی ئەو ناکۆکیەی ڕوویـداوە لە نێـوان زانایـان لەم بابەتەدا.

زانایانی ئەهلی سوننە ناکۆك بوون لە دەربارەی حـوکمی کـوفری کـۆمەڵەی ڕەتـکەرەوە بەپێـی ئەو نـاکۆکیەی نێوان صەحابە -رضي الله عنهم-، جا شافیعی -رحمه الله- بۆ ئەوە چووە کە زەکات نەدەرەکان کافر نەبوون، وە پێی وابووە درانە پاڵیان بۆ ڕیدە دانەپـاڵێکی زمـانەوانی بـووە نەك شـەرعی، بـۆیە بـۆ ئەوە چـووە کە صـەحابە ناکۆکن و جیاواز بوون لە جەنگکردن هاوکات لەگەڵ کۆك بوونیـان لەسـەر تەکفیـر نەکردنیـان، وە بـەجۆرێك باسی کردوون کە ئەوان بەهۆی تەئویل ڕەتیان کردەوە مافێك بدەن بە ئیمام.

ئیمامی شافیعی -رحمه الله- دەڵێت: "وە هەڵگەڕاوەکان دوای پێغەمـبەر (ﷺ) بـوون بە دوو بەش؛ هەیـان بـوو کەسانێك بوون گومڕا بوون دوای ئیسـلام وەك (طليحـة ومسـيلمة والعنسي)ـ و هاوڕێکانیـان، وە هەیـان بـوو کەسانێك بوون دەستیان گرتبوو بە ئیسلام و ڕەتیان کردەوە سەدەقەکان بدەن، بۆیە ئەگەر کەسێك بڵێت: بەڵـگە

چییە لەسەر ئەمە لە کاتێکدا بە گشتی پێیان دەڵێن: هەڵگەڕاوەکان؟ شافیعی دەڵێت: ئەمە زمانی عەرەبییە؛ ڕیدە هەڵگەڕانەوەیە لەوەی لەسەری بوون بۆ کوفر، وە هەڵگەڕانەوە بە ڕەتکردنەوەی حەقەکە، دەڵێت: وە هەر کەسێك پاشگەز ببێتەوە لە شتێك دروستە بوترێت هەڵگەڕایەوە لەم شتە"، وتەکەی کۆتایی هات.

بە هەمان شێوە ئیمامی أحمد بۆ ئەوە چووە لە گێڕانەوەیەك لەوەوە، جا (الأثرم) لەویەوە نەقڵی کردووە دەربارەی ئەو کەسەی ڕۆژووی ڕەمەزان وازلێدێنێت: "ئایا وەك نوێژنەکەرە؟ وتی: نوێژ پەیمانێکی پتەو و بەتینە وەك جگە لەخۆی نییە. جا پێی وت: ئەی وازهێنەر لە زەکات؟ وتی: لە عبد الله ـەوە هاتووە: زەکات نەدەر موسڵمان نییە، وە ئەبو بەکر لەسەری جەنگا و فەرموودەکەش لە دەربارەی نوێژە"، وتەکەی کۆتایی هات.

(القاضي أبو يعلي) دەڵێت: "ڕواڵەتی ئەمە ئەوەیە کە وتەی عبد الله، و کرداری ئەبی بەکر دەگێڕێتەوە، و نەیبڕاندەوە بەمە چونکە وتی: فەرموودەکە لە دەربارەی نوێژە، واتە فەرموودەی هاتوو بە باسکردنی کوفر ئەمە لە نوێژدایە، وە فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) : (بينَ العبدِ وبينَ الكفرِ ترْكُ الصَّلاةِ فمَن تركَ الصَّلاةَ فقَد كَفَرَ)، واتە: لە نێوان بەندە و کوفر نوێژنەکردن و وازلێهێنانیەتی جا هەر کەسێك واز لە نوێژ بهێنێت ئەوا کوفری کردووە. وە لەبەرئەوەی زەکات مافێکە لە ماڵ و سامان بۆیە بە نەدانی تەکفیر ناکرێت، جەنگکردنیش لەسەری وەك کەفارەتەکان و مافەکانی ئینسانەکانە"، وتەکەی کۆتایی هات.

شێخی ئیسلام دەڵێت: پاشان زانایان ناکۆك و جیا بوون لە دەربارەی کوفری زەکات نەدەر، و ئیمامیش لەسەری جەنگا سەرەڕای دانپیادانان بە واجبوونی لەسەر دوو وتە، کە ئەویش دوو ڕیوایەتە لە أحمد ـەوە وەك دوو ڕیوایەتەکە لەویەوە لە دەربارەی تەکفیرکردنی خەواریج"، وتەکەی کۆتایی هات.

## بابەتی سێیەم: ئایا کەسی موخالیف لە دەربارەی کوفری کۆمەڵەی ڕەتکەرەوە موبتەدیعە یان سوننی؟

دەڵێین: هەر کەسێك بڵێت کۆمەڵەی ڕەتکەرەوە کوفری نەکردووە و لەسەر وتەکەشی ئەوە بنیات بنێت کە ئیمان وتەیە بەبێ کردار، ئەوا ئەو کەسە مورجیئەیە، بەڵام ئەو کەسەی دەڵێت: ئیمان وتە و کردارە و پاشان کۆمەڵەی ڕەتکەرەوە تەکفیر نەکات، ئەوا موبتەدیع نییە، بەڵکو موجتەهیدێکە هەڵەی کردووە، وە ئیمامی شافیعی لەم چینەیە، ئەو لەو کەسانەیە کە دانیناوە بەوەی ئیمان وتە و کردارە وەك هەموو پێشەوایانی سوننەت و جەماعە.

ئیمامی شافیعی -رحمه الله- دەڵێت: "ئیجماع هەیە لە صەحابە و تابیعین لەوانەی پێیان گەیشتووین، لەسەر ئەوەی ئیمان وتە و کردار و نیەتە،

ئەم بابەتەش هاوشێوەی ناکۆکی و جیاوازییەکەیە لە دەربـارەی کـوفری نـوێژنەکەر؛ لە زانایـان هەیە بـۆ ئەوە چووە کە نوێژنەکەر کافر نییە لەگەڵ ئەوەی وتویانە: ئیمان وتە و کردارە، جا ئەمە سوننیە نەك موبتەدیع.

سەبارەت بەو کەسەی دەڵێت نوێژنەکەر کـافر نیـیە یـان دەکوژرێـت دوای ئەوەی داوای لێکـرا نـوێژ بکـات ئەوکاتە دەکوژرێت بە موسڵمانیەتی ئەوا تووشی ئەو شوبهەیە بووە کە مورجیئە و جەهمـیە دوچـاری بـوون لە پێکهاتەی ئیمان، دواتریش بەپێی وتەکەی تەکفیر ناکات لەسەر ئەمە.

شێخی ئیسلام -رحمە اللە- دەڵێت: "جا ئەم شوێنە پێویستە وردبوونەوە و تێفکرینی تێدا بکرێـت؛ هەر کەسـێك ڕواڵەتی بەستەوە بە ناخ، شوبهەی لەسەر لاچووە لەم بەشەدا، وە زانراوە ئەوەی لە زانایان وتبێتی ئەگەر دانی نا بە واجبوونەکەی و ڕەتی کردەوە کارەکە ئەنجـام بـدات ناکوژرێـت، یـان دەکوژرێـت بە موسـڵمانیەتی، ئەوا تووشی ئەو شوبهەیە بووە کە مـوڕجیئە و جەهمـیە تووشـی بـوون، وە ئەو کەسـەش کە ویسـتی بـڕاوە لەگەڵ توانای تەواوی لە کرداردا هەژمار نەکردووە، بـۆیە ڕەتکەرەوەکـان لە زانایـان لە کوشـتنی ئەم جـۆرە کەسـەدا لەسەر گوفتارەکەیان بنیاتناوە لە بابەتی ئیمان، و کە کردارەکانیش لە ئیمان نییە"، وتەکەی کۆتایی هـات -رحمـە اللە-.

**نموونەیەك لەسەر ئەمە دەهێنینەوە:**

لە (ابـن شـهاب الزهـري ـەوەیە -رحمـە اللە-)، کە (المـروزي) دەگێـڕێتەوە لە (ابـن شـهاب الزهري)ــەوە لە دەربارەی بە گەورەدانانی ڕێز و گەورەیی نوێژ کاتێك پرسیاریان لێکرد دەربارەی پیاوێك واز لە نوێژ بێنێت جـا وتی: "ئەگەر وازلێهێنانەکەی لەبەرئەوە بێت کە دینێکی تری داهێناوە جیا لە دینی ئیسلام(هەڵگەڕابێتەوە) ئەوا دەکوژرێت، وە ئەگەر لەبەر ئەمە نەبێت ئەوا فاسیقە و لێی دەدرێت بە لێدانێکی توند و زیندانی دەکرێت."

ئەمەش ئاشکرایە کە (ابن شهاب) وای نەبینیوە نوێژنەکەر کافر بێت، وە (اللالکائي) لە (معقل ابـن عبیـد اللە العبسي) دەگێڕێتەوە کە بە (نافع) مەولای (ابن عمر)ـی وتوە: وتم ئەوان دەڵێن ئـێمە دانـدەنێین بە فەڕزییێتـی نوێژ و نوێژیش ناکەین، وە ئاڕەق حەڕامە و ئێمەش دەیخـۆینەوە، و مـارەکردنی دایکەکـان حەڕامە و ئـێمەش دەمانەوێت، جا دەستی ڕاکێشام و وتی: هەر کەس ئەمە بکات کافرە.

معقل وتی: بە زوهری گەیشتم و هەواڵم پێدا دەربارەی قسە و گوفتارەکەیان و ئەویش وتی: پاکی و بـێگەردی بۆ اللە، ئەوە بەڕاستی خەڵکی کەوتونەتە وتنـی ئەم گوفتـار و ململانێـیەوە، رسـول اللە (ﷺ) فەرمـوویەتی: (لا يَزْني الزّاني حِينَ يَزْنِي وَهُوَ مُؤْمِنٌ، وَلا يَشرَبُ الشاربُ الخَمْرَ حِينَ يَشْرَبُهَا وَهُوَ مُؤْمِنٌ)، واتە: هیچ زیناکەرێـك نییە لە کاتی زیناکردندا ئیماندار بێت، وە هیچ ئاڕەق خۆرێك نییە لە کاتی خواردنەوەیدا ئیماندار بێت.

سەرنج بدە وتەکەی کە تەکفیری نوێژنەکەر ناکات لەگەڵ ئینکـاری کردنـی لەسـەر مـوڕجیئە ئەوانەی کـردار دەردەکەن لە پێکهاتەی ئیمان، جا ئەمەیە وامان لێ دەکات نموونەی ئیمام زوهـری بە ئیرجـاء تۆمەتبـار بکەیـن

تەنها لەبەرئەوەی وای نەبینیوە نوێژنەکەر کافر بێت، بۆیە باش وردبەرەوە و سەرنج بدە لەم شوێنەدا، هەڵمەخەڵەتێ بە زۆری ئاژاوەگێران، و وتەی زیادەڕەوەکان، واللہ المستعان.

## لە کۆتاییدا پێویستە لێرەدا ئاگاداربین لە باسێکی گرنگ

کە ئەویش زۆربەی ئەوانەی ئەمڕۆ دەجەنگین لەگەڵیان لە کۆمەڵەکانی کوفر و ڕیدە، ئەو ناکۆکی و جیاوازییەی لەنێوان زانایان هەبووە لە دەربارەی کۆمەڵەی ڕەتکەرەوە، لەسەریان ناچەسپێت و نایانگرێتەوە؛ سوپاکانی دەوڵەتە تاغوتییەکان و پۆلیسەکانیان و پشتیوانەکانیان کافرن بە ئیتیفاق، ئەوانە نزیکترن لە هاوشێوەکانیان وەك شوێنکەوتوانی موسەیلەمە و ئەسوەد لەوەی نزیك بن لە زەکات نەدەرەکان؛ جا سەربازانی تاغوت و هەر کەسێکیش دەجەنگێت لە پێناویدا کافرە بە دەقی قورئانی پیرۆز، هەروەك اللہ تعالی دەفەرموێت: {الَّذِينَ آمَنُوا يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ ۖ وَالَّذِينَ كَفَرُوا يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ الطَّاغُوتِ فَقَاتِلُوا أَوْلِيَاءَ الشَّيْطَانِ ۖ إِنَّ كَيْدَ الشَّيْطَانِ كَانَ ضَعِيفًا} (النساء: ٧٦) ، واتە: ئەوانەی ئیماندارن لە پێناوی اللہ دا دەجەنگن (بەڵام) ئەوانەی بێ باوەڕن لە پێناوی تاغوت دەجەنگن، دە بجەنگن دژی یاوەرانی شەیتان، بەڕاستی پیلان و تەڵەکەی شەیتان پووچ و لاوازە.

هەر کەسێك پشتیوانی تاغوت بکات لەسەر حوکم کردن بە جگە لەوەی اللہ دایبەزاندووە، وە لەسەر دژایەتی کردنی دۆستانی اللہ ئەوا کافرە وەك ئەو -تاغوتەکە-؛ چونکە ئەوەی دۆستایەتی و پشتیوانی کافران بکات ئەوا لەوانە بەپێی فەرموودەی اللہ تعالی:{وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَإِنَّهُ مِنْهُمْ ۗ إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ} (المائدة: ٥١) ، واتە: هەر کەسێکیشتان دۆستایەتییان لەگەڵ بکات، و بیانکات بە یارمەتیدەر و دۆستی خۆی، وە یان هاوکاری و هاوڕێییان بکات ئەوا بێ شك ئەو کەسە لەوانە و بەوان دادەنرێ، بێگومان اللہ هیدایەت و ڕێنمایی گەلی ستەمکار ناکات.

هەروەك لەگەڵمان بوون کە باسی بەڕائەت کردن لە موشریکەکان و دۆستایەتی و سەرخستنی موەحیدانمان کرد لە بنچینەی دین کە تیایدا هیچ کەس عوزری نەزانین و تەئویلی بۆ ناهێنرێتەوە، ئەمەش کۆڕا و یەکدەنگی لەسەرە بحمد اللہ تعالی.

بەم ئەندازەیە دێینە کۆتایی، وە داواکارین لە اللہ تعالی سوودبەخشمان بکات بەوەی فێرمان دەکات، وتەمان لەسەر حەق کۆ بکاتەوە، و بمانکات بە هیدایەتدراو و ڕێنموونیکار، وآخر دعوانا أن الحمد للہ رب العالمین.

# ئەڵقەی شەشەم

الحمد لله رب العالمين، والعاقبة للمتقين، ولا عدوان إلا على الظالمين، وأشهد أن لا إله إلا الله، وحده لا شريك له، الملك الحق المبين، وأشهد أن محمداً عبده ورسوله، إمام الأولين والآخرين، أما بعد:

لەم ئەڵقەیەدا باسی دوو تەوەر دەکەین بە ئیزنی الله تعالى:

## تەوەری یەکەم: دەربارەی خاکەکان و حوکمەکانیان.

## تەوەری دووەم: دەربارەی هیجرەت و حوکمەکانی.

**وە لە تەوەری خاکەکان باسی چەند بابەتێك دەکەین:**

**یەکەم:** واتای خاك (الدار)، و دابەشبوونی جیهان بۆ دوو خاك.

**دووەم:** پێناسەی خاکی ئیسلام (دار الإسلام)، و خاکی کوفر (دار الكفر).

**سێیەم:** هۆکاری حوکمدان لەسەر خاك بە ئیسلام یان کوفر.

**چوارەم:** بەشەکانی خاکی کوفر.

**وە لە تەوەری هیجرەت باسی چەند بابەتێك دەکەین:**

**یەکەم:** حوکمی هیجرەت کردن.

**دووەم:** حوکمی تەرك کردنی هیجرەت.

**سێیەم:** حاڵ و بارەکانی نیشتەجێبووان لە خاکی کوفر.

**ئێستاش دەست دەکەین بە تەوەری یەکەم کە پەیوەستە بە حوکمەکانی خاکەکان:**

## بابەتی یەکەم لە تەوەری یەکەم:

**واتای (الدار)، و دابەشبوونی جیهان بۆ دوو جۆرە خاك؛ وە واتای خاك (الدار) لە زاراوەییدا:**

زانایان لە پێشین و دوای ئەوانیش جیهانیان دابەش کردووە بۆ دوو خاك؛ خاکی ئیسلام و خاکی کوفر، ئەم دابەشکردنەش چەسپاوە و بنیانراوە بەپێی پەرتوکی الله، و سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ).

جا لە پەرتوکی الله تعالى، دەفەرموێت: {وَالَّذِينَ تَبَوَّءُوا الدَّارَ وَالْإِيمَانَ مِن قَبْلِهِمْ يُحِبُّونَ مَنْ هَاجَرَ إِلَيْهِمْ}

(الحشر: ٩).

ئیمام (ابن كثير -رحمه الله-) دەڵێت: "واتە نیشتەجێبوون لە خاکی هیجرەت پێش موهاجیرەکان و ئیمانیان هێنا پێش زۆرێك لەوان"، وتەکەی کۆتایی هات.

الله تعالی دەفەرموێت: {إِنَّ الَّذِينَ تَوَفَّاهُمُ الْمَلَائِكَةُ ظَالِمِي أَنفُسِهِمْ قَالُوا فِيمَ كُنتُمْ ۖ قَالُوا كُنَّا مُسْتَضْعَفِينَ فِي الْأَرْضِ ۚ قَالُوا أَلَمْ تَكُنْ أَرْضُ اللَّهِ وَاسِعَةً فَتُهَاجِرُوا فِيهَا ۚ فَأُولَٰئِكَ مَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ ۖ وَسَاءَتْ مَصِيرًا} (النساء: ٩٧)

، واتە: بەڕاستی ئەوانەی لە سەرە مەرگدا فریشتە گیانیان دەکێشن لە کاتێکدا ئەوان هەمیشە ستەمیان لە خۆیان دەکرد (ئیمان و باوەڕیان لە مەترسیدا بوو کەچی کۆچیان نەدەکرد بۆ نیشتمانی ئیمان، بەتوندی پیایاندا هەڵدەشاخێن) و دەڵێن: باشە ئێوە لە چیدا بوون و لە کوێ ژیانتان دەبردە سەر؟! لە وەڵامدا دەڵێن: ئێمە بێ دەسەڵات و لاواز کراو بووین لە زەویدا، فریشتەکان دەڵێن: باشە ئایا زەوی الله فراوان نەبوو تا کۆچی تێدا بکەن (کۆچ بکەن بۆ نیشتمانێك کە ئیماندارن تیایدا فەرمانڕەوان یاخود سەربەستن) ئا ئەوانە جێگایان دۆزەخە، کە ئەویش چارەنووسێکی نالەبار و خراپە.

هیجرەت یش کاتێك هاتبێ و بەکارهێنرابێت لە قورئان و سوننەت، ئەوا بە مانای گواستنەوە دێت لە خاکی کوفر بۆ خاکی ئیسلام.

سەبارەت بە سوننەت، دابەشکردنی خاکەکان لە ژمارەیەك فەرموودەدا هاتووە: لەمانەش ئەوەی هاتووە لەو فەرموودەیەی موسلیم ڕیوایەتی کردووە لە (بريدة بن الحصيب ـەوە -رضي الله عنه-) بە مەرفوعی: (ثُمّ ادعُهم إلى الإسلامِ، فإن أجابوكَ فاقبَل منهم وكفّ عنهُم، ثمّ ادعُهم إلى التّحوُّلِ من دارِهم إلى دارِ المُهاجرينَ، وأخبرهم أنّهم إن فعلوا ذلِكَ فلَهم ما للمُهاجرينَ، وعلَيهم مَا علَى المُهاجرينَ). واتە: پاشان بانگیان بکە بۆ ئیسلام، ئەگەر وەڵامیان دایتەوە ئەوا لێیان قبوڵ بکە و دەستیان لێ بکێشەوە پاشان بانگیان بکە بۆ جێگۆڕین لە خاکەکەیانەوە بۆ خاکی موهاجیرەکان، وە پێیان ڕابگەیەنە ئەگەر ئەمەیان کرد ئەوا ئەو شتانەیان بۆ هەیە کە بۆ موهاجیرەکان هەیە، و ئەو ئەرکانەشیان لەسەرە کە لەسەر موهاجیرەکانە).

(النسائي -رحمه الله-) بە سەنەدێکی صەحیح گێڕاویەتیەوە، لە (جابر بن زيد ـەوە -رضي الله عنه-) کە وتویەتی: (ابن عباس -رضي الله عنهما-) وتی بەڕاستی پێغەمبەر (ﷺ) و ئەبو بەکر و عمر لە موهاجیرەکان بوون، چونکە موشریکەکانیان جێهێشت و لێیان دوورکەوتنەوە، وە لە پشتیوانانیش موهاجیر هەبوون، چونکە مەدینە خاکی شیرك بوو، جا شەوی (العقبة) هاتن بۆ لای رسول الله (ﷺ).

## بابەتی دووەم لە تەوەری خاکەکان: پێناسەی خاکی ئیسلام (دار الإسلام) و خاکی کوفر (دار الكفر).

خاکی ئیسلام: بریتییە لە هەر وڵات و شارێك یان شوێنێك حوکمەکانی ئیسلام تیایدا بەرز و بڵند بێت، زاڵبوون و هێز و قسە بۆ موسڵمانان بێت، ئەگەرچی زۆربەی دانیشتوانی ئەم خاکە لە کافران بن.
بەڵام خاکی کوفر: بریتییە لە هەر وڵات و شارێك یان شوێنێك حوکمەکانی کوفر تیایدا بەرز بێت، و زاڵبوون و هێز و قسە بۆ کافران بێت، ئەگەرچی زۆربەی دانیشتوانی ئەم خاکە لە موسڵمانان بن.
ئیمام (ابن القيّم -رحمه الله-) دەڵێت: "خاکی ئیسلام ئەو خاکەیە موسڵمانان چوونەتە ناویەوە و فەتحیان کردووە، و حوکمەکانی ئیسلامی تیادا جێبەجێ دەکرێت، وە ئەگەر حوکمەکانی ئیسلامی تیادا جێبەجێ نەکرێت ئەوا نابێتە خاکی ئیسلام، ئەگەرچی پێیەوە بلکێندرێت، ئەمە تائیف ـە کە زۆر لە مەککە نزیك بوو، نەبوو بە خاکی ئیسلام بەهۆی فەتحی مەککەوە، بە هەمان شێوە ساحیل ـیش"، وتەکەی کۆتایی هات.
(ابن مفلح -رحمه الله-) دەڵێت: فصلٌ في تحقيق دار الإسلام ودار الحرب؛ هەر خاکێك حوکمەکانی موسڵمانان تیایدا زاڵ و بەرقەرار بوو ئەوا خاکی ئیسلامە، وە ئەگەر حوکمەکانی کافران تیایدا زاڵ و بەرقەرار بوو ئەوا خاکی کوفرە، جگە لەم دووانە هیچ خاکێکی تر نییە". وتەکەی کۆتایی هات.

## بابەتی سێیەم: هۆکاری حوکمدان لەسەر خاك بە ئیسلام یان کوفر.

بە خوێندنەوە و بەدواداچوون بۆ وتەی زانایان دەردەکەوێت کە ئەوان دوو هۆکار باس دەکەن بۆ حوکمدان لەسەر خاك:

**یەکەم: هێز و دەسەڵات.**

**دووەم: جۆری حوکمە جێبەجێکراوەکان تیایدا.**

(ابن حزم -رحمه الله-) دەڵێت: "وە فەرموودەی پێغەمبەر -صلى الله عليه وسلم-: (أنا بَرِيٌّ مِن كُلّ مُسلِمٍ أَقَامَ بَينَ أَظهُرِ المُشرِكِينَ)، واتە: من بەریئم لە هەر موسڵمانێك بمێنێتەوە و نیشتەجێ ببێت لەنێو موشریکەکان. ئەمە ڕوون دەکاتەوە کە وتمان، وە ئەو -عليه السلام- لێرەدا مەبەستی (دار الحرب)ـە، ئەگەرنا خۆی -عليه السلام- والی و کارگوزارەکانی دانا لەسەر خەیبەر، کە هەمووی جوولەکە نشین بوو، وە ئەگەر ئەهلی زیممە لە شارەکانیان جگە لە خۆیان کەس تێکەڵاوی نەدەکردن، ئەوا نیشتەجێبووێك لەناویاندا بۆ بەڕێوەبردنی کاروباریان، یان بۆ بازرگانییێك لەناویاندا پێی ناوترێت کافر، وە یان خراپەکار، بەڵکو موسڵمانێکی چاکە، و خاکەکەیان خاکی ئیسلامە نەك خاکی شیرك، چونکە خاکەکە پاڵدەدرێت بۆ ئەوەی زاڵبووە بەسەریدا، و دەسەڵاتدار تیایدا"، وتەکەی کۆتایی هات.
وە لە (أبي يوسف، و محمد بن الحسن -رحمهما الله تعالى-: "ئەگەر حوکمەکانی شیرك دیار و ئاشکرابوو

تیایدا، ئەوا خاکەکەیـان دەبێـت بە خـاکی حەڕب -کفـر-، چـونکە شـوێنەکە کە پاڵـدەدرێتە پـاڵیان یـان ئەوان بەگوێرەی هێز و دەسەڵاتەکەیە، جا هەر شوێنێك حوکمی شـیرك تیایـدا ئاشـکرا و دیـاربوو، ئەوا هێـزیش لەم شوێنە بۆ موشریکەکان دەبێت، و دەبێتە خاکی حەڕب، وە هەر شوێنێکیش ڕواڵەتەکەی حـوکمی ئیسـلام بـوو، ئەوا هێز تیایدا بۆ موسڵمانانە"، وتەکەیان کۆتایی هات.

شەوکانی -رحمە اللە- دەڵێت: "حوکمدان لەسەر خاك بەپێی دەرکەوتن و ئاشکرایی وتە و قسەیە، ئەگەر هاتوو فەرمانەکان و قەدەغەکردنەکان لە خاکەکە بۆ موسـڵمانان بـوو، بە جۆرێـك ئەو کـافرانەی لەناویـدان نـاتوانن بەکوفرەکەیانەوە دەربکەون، مەگەر ئەوەی مۆڵەتی پێدرابێت لە لایەن موسـڵمانانەوە، ئەوا خـاکی ئیسـلامە، وە دەرکەوتنی سیفەت و سیما کوفرییەکان تیایدا زیان ناگەیەنێت، چونکە بە هێز و قوەتی کافران و هێرشـکردنیان دەرنەکەوتـووە، هەروەك لە ئەهلـی زیمـمە لە جـوولەکە و نەسـاڕا دا دیـارە، وە بە هەمـان شـێوە موعاهیـدە نیشتەجێبووەکان لە شارە ئیسلامییەکان، وە ئەگەر کارەکە بە پـێچەوانە بـوو ئەوا خـاکەکەش بە پـێچەوانەیە"، وتەکەی کۆتایی هات.

## بابەتی چوارەم: بەشەکانی خاکی کوفر.

**خاکەکانی کوفر لە ڕووی کوفر هەبوون تیایدا لە کۆنەوە یان نوێ بێت، دەبێتە دوو بەش:**

**بەشی یەکەم:** خاکی کوفری ئەسڵی: بریتییە لەو خاکەی ڕۆژێك لە ڕۆژان نەبووەتە خاکێکی ئیسلام.

**دووەم:** خاکی کوفری (الطارئ) : کە خاکێکی ئیسـلام بـووە لە کاتێـك لە کاتەکـان، پاشـان کـافران دەسـتیان بەسەردا گرتووە، یان دەسەڵاتدارەکانی مورتەد بـوونەتەوە، یـان خەڵـکەکەی مـورتەد بـووەتەوە و حوکمەکـانی کوفریان بەسەردا دەسەپێت.

جا سیفەتی خاك لە سیفەتە جێگیرە هەتا هەتاییەکان نییە، بەڵکـو لە سـیفەتە گۆڕاوەکـانە، بە واتـای: خـاکەکە دەگۆڕێت لە سیفەتێکەوە بۆ ئەوی تر، دەشێت خـاکەکە خـاکێکی کـوفر بێـت لە ڕۆژگارێکـدا، پاشـان دەبێـتە خاکێکی ئیسلام، وە دەکرێت خاکێکی ئیسلام بێت پاشان ببێتە خاکێکی کوفر.

شێخی ئیسلام (ابن تیمیة -رحمە اللە-) دەڵێت: "جا زەوی خاکێکی کوفرە، یان خاکێکی ئیسلام یان ئیمانە، یـان خاکێکی ئاشتی یان جەنگە، یان خاکێکی گوێڕایەڵی و تاعەت یان سەرپێچی کردنە، یان خاکی ئیماندارانە یـان خاکی فاسیقەکانە، سیفەتانێکی دژ و پێچەوانەیە نەك پەیوەست، بۆیە لە وەسفێکەوە دەگۆڕێـت بـۆ وەسـفێکی تر، هەروەك کەسێك خۆی دەگوازێتەوە لە کوفرەوە بۆ ئیمان و زانست، بە هەمـان شـێوە بە پێچەوانەوەشـەوە"، وتەکەی کۆتایی هات -رحمە اللە.-

## لێرەدا ئاگاداریيەکی گرنگ هەیە

**ئەویش بریتییە لەوەی حوکمدان لەسەر خاك بەوەی خاکی کوفرە، ئەسڵی بێت یان (طارئ)، پەیوەست نییە و نـابێتە هـۆی ئەوەی حـوکم بـدرێت لەسـەر ئەو موسـڵمانانەی تیایـدان بەوەی کـافرن، بەڵکـو ئەمە وتەی زیادەڕەوەکانە، و ڕێچکەیەکە لە ڕێچکەکانی خەواریج.**

ئەشعەری -رحمه الله- باسی ئەم وتەیەی کردووە لە یەکێك لە فیرقەکانی خەواریجەوە، جا دەڵێـت: "ئەزاریـقە پێی وایە ئەوەی لە خـاکی کـوفر بمێنێـتەوە و نیشـتەجێ بێـت ئەوا کـافرە، هـیچ چارەسـەرێکی نیـیە جـگە لە دەرچوون"، وتەکەی کۆتایی هات.

وە لە دەربارەی خەواریجی "البيهسية والعوفية" دەگێڕێتەوە کە ئەوان دەیانوت: "ئەگەر پێشەوا کافر بـوو ئەوا هەموو خەڵکەکەی ژێر دەسەڵاتی کافر دەبن"، وتەکەی کۆتایی هات.

ئەمەش لەبەرئەوەی بنچینە بریتییە لە مانەوەی موسڵمان لەسەر ئیسلامەکەی لەسـەر هەمـوو خاکێـك، و لەژێـر هەموو ئاسمانێك، تـا ئەوکـاتەی هـیچ هەڵوەشـێنەرەوەیەکی لە هەڵوەشـێنەرەوەکانی ئیسـلام ئەنجـام نەدابێـت، ئەوەشی بە دڵنیابوون چەسپاوە و جێگیربووە، بە گومان لاناچێت.

ئیمامی شەوکانی -رحمه الله- دەڵێت: "بزانە کە باسکردنی خاکی ئیسلام و خاکی کوفر، سـوودەکەی زۆر کەمە -واتە لە حوکمدان لەسەر نیشتەجێبووانی- لەوەی باسمان کرد لە قسەکردن لەسـەر خـاکی حەڕب -کـوفر-، وە کافری شەڕخواز خـوێن و سـامانی حەڵاڵە لەسـەر هەر بـارێکەوە بێـت، ئەگەر ئەمـانی پێنەدرابێـت لە لایەن موسڵمانانەوە، وە سامان و خوێنی موسڵمان حەڕام و پـارێزراوە بە پاراسـتنی ئیسـلام، لە خـاکی حەڕب و جـگە لەوێش"، وتەکەی کۆتایی هات.

## وە وردبوونەوە و دروست ئەوەیە بوترێت:

حوکمی دانیشتوان لە خاکی کوفری (الطارئ)، یان وتنـی ئـەوەی بنچیـنە تیایانـدا ئیسـلامە یـان کـوفر، یـان حوکمی ئەو کەسەی حاڵی نادیارە (مجهول الحال) تیایاندا، جیاواز دەبێت بە جیاوازی بارەکان، وە هەموویان حوکمی فیقهیین دەگەڕێنەوە بۆ فەتواکانی زانایان، هەر بۆیەش وتەکانیان جیاواز بووە بە جیـاوازی بارەکـانی نیشتەجێبووەکان لەم خاکانە.

**ئەمەش هەندێك نموونە لەسەر ئەمە:**

## نمـوونەی یەکەم: فەتـوای شـێخی ئیسـلام -رحمـە اللە- لە دەربـارەی خەڵکی (ماردین).

کە خاکێکی ئیسلام بوو و تەتار دەستیان بەسەردا گرت، و حوکمەکانی کوفری تیایدا سەپێنرا.

پرسیاری لێکرا -رحمە اللە- دەربارەی شاری (ماردین) کە ئایا خاکی کوفرە یان خاکی ئیسلام، وە ئایـا واجـبە لەسەر موسڵمانی نیشتەجێبوو تیایدا هیجرەت بکات بۆ وڵاتی ئیسلام یان نا، وە ئەگەر هیجرەتی لەسـەر واجـب بوو و کۆچیشی نەکرد، و یارمەتی دوژمنانی موسـڵمانان بـدات بە گیـانی یـان سـامانی، ئایـا گوناهبـار دەبێـت لەمەدا؟ وە ئایا ئەو کەسەی بە نیفاق وەسفی بکات و قسەی پێ بڵێت، گوناهبار دەبێت یان نا؟

جا وەڵامی دایەوە: سوپاس و ستایش بۆ اللە؛ خوێن و ماڵی موسڵمانان لە هەر کوێ بن حەڕامە لە مـاردین بـن یان لە غەیری ماردین، وە یارمەتیـدانی کەسـانی دەرچـوو لە شـەریعەتی دینـی ئیسـلام حەڕامە، جـا خەڵکـی ماردین بن یان لە غەیری ئەوان، دانیشتوو تیایدا ئەگەر بێ توانـا بێـت لە بەرپـاکردنی دیـنەکەی ئەوا واجـب دەبێت کۆچ بکات، بەڵام ئەگەر توانای هەبێت دینەکەی بەرپا بکات ئەوا کۆچ کردن سوننەتە.

وە یارمەتیدانی دوژمن بە گیان و بە ماڵ و سامان یاساغ و حەڕامە پێویستە لەسەریان ڕێگری بکەن لەو کارە و ڕەتی بکەنەوە بەهەر شێوەیەك کە دەتوانن، لە خۆشـاردنەوە یـان پشـت تێکـردن یـان فڕوفێڵکـردن، جـا ئەگەر نەئەکرا تەنها بە کۆچکردن نەبێت، ئەوا کۆچ کردن لەسەریان پێویست دەبێت، وە حەڵاڵ نییە جنێـو بـدرێت بە خەڵکی ماردین بە گشتی وە تۆمەتی نیفاقیـان بـدرێتە پـاڵ، بەڵکـو قسـەپێوتن و نیفـاق لە قورئـان و سـوننەت دەدرێتە پاڵ سیفەتە دیاریکراوەکان، کە هەندێك لە خەڵکی ماردین و جگە لەوانیش دەگرێتەوە.

سەبارەت بەوەی دەوترێت ئایا خاکی ئیسلامە یان کوفرە ئەوا لە وەڵامدا دەڵێـین دارێکـی تـێکەڵاوە و هەردوو ماناکەی تێدایە؛ نە خاکی ئیسلامە بەو جـۆرەی حوکمەکـانی ئیسـلامی تێـدا پەیـڕەو بکرێـت و سـەربازەکانی موسڵمان بن، وە نە خاکی کوفریشە کە خەڵکەکەی کافر بێت، بەڵکو بەشی سـێیەمە موسـڵمان مـامەڵەی لەگەڵ دەکرێـت بە گـوێرەی ئەوەی شـایەنێتی وە جەنـگ لەگەڵ کەسـانی دەرچـوو لە شـەریعەتی ئیسـلام دەکرێـت بەگوێرەی ئەوەی شایستەیانە. وتەکەی کۆتایی هات.

سەرنج بدە چۆن حوکمی دا لەسەر دانیشتوانەکە بەوەی دروست نیـیە بە گشـتی تۆمەتبـار بکـرێن و نیفاقیـان بدرێتە پاڵ، نەك کافربن بەم شێوەیەی خـاکی حەڕب، لەگەڵ ئەوەی حـوکمی دا لەسـەر سـەربازەکانی بەوەی موسڵمان نیین، هەموو ئەمانە لە ماردین، کە خاکی کوفری (طارئ)ـە.

## نموونەی دووەم: فەتوای (حمد بن عتیق -رحمە اللّٰە-) لە دەربارەی خەڵکی (الأحساء).

دەڵێت: "وە هەر یەکێك بەشداری کردووە لەوەی لێکۆڵەرەوەکان بڕیاریان داوە و دانیان پیادانـاوە، بە وردی بۆی دەرکەوتووە ئەگەر شارێك شیرکی تیادا ئاشکرا و دیاربوو، و تیایدا بە ئاشکرا حەڕامکراوەکان ئەنجام دەدرا، و سیما و دروشمەکانی دین پەکخرا تیایدا: دەبێتە وڵاتی خاکی کوفر، ماڵ و سامانی خەڵکەکەی بە غەنیمەت دەگیرێت، و خوێنیان حەڵاڵ دەبێت، وە خەڵکی ئەم شوێنە دەرخستنی سوکایەتی کردن و جنێودانیان زیادکرد بە خۆی -موسڵمان- و بە دینەکەی، و قانونیان دانا و بەسەر ژێردەستەکەیان سەپاند و جێبەجێیان کرد کە پێچەوانەی پەرتووکی اللّٰە و سوننەتی پێغەمبەرەکەیەتی، وە زانراو و ئاشکرایە کە ئەمە بەسە بۆ ئەوەی ئەنجامدەرەکەی دەربچێت لە ئیسلام، لەگەڵ ئەمەش ئێمە دەڵێین لەوانەیە کەسی وای تێدا هەبێت حوکمی بەسەردا نادرێت بە کوفر لە ناخدا لە چەوساوەیەك و هاوشێوەی، بەڵام لە ڕواڵەتدا -وللّٰە الحمد- ئاشکرا و ڕوونە، ئەمە بەسە کە ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ)کردی لە مەککە سەرەڕای ئەوەی تیایاندا هەبوو چەوساوە بوون، بە هەمان شێوە ئەوەی هاوەڵانی کردیان بە زۆرێك لەوانەی مورتەد بوونەوە لە ئیسلام، لە حەڵاڵ کردنی خوێن و ماڵ و سامان و بەکەنیزە کردن، وە هەموو عاقڵ و زانایەك دەزانێت کە ئەوەی ئەمانە ئەنجامیاندا لە کوفر و ڕیدە ناشرینتر و قێزەونتر و زیاتر بوو لەوەی ئەوانە کردوویانە، چاو بگێڕە بە دەقەکانی قورئان و سوننەت و لە ژیاننامەی پێغەمبەر (ﷺ) و هاوەڵانی، بە سپییتی پاك دەستت دەکەوێت کەس لێی لانادات تەنها بە هیلاکچوو نەبێت، بگەڕێ بەدوای باسکردنی زانایان لەوبارەیەوە، وە ڕووبکە اللّٰە لە هیدایەتی دڵ و لابردنی گومان و شوبهە، وە گومانم نەدەبرد پرسیاری لەم شێوەیەیە لە نموونەی وەك تۆ دەربچێت، و هەڵمەخەڵەتێ بەوەی نەزان و نەفامەکان لەسەرینە، وە بەوەش کە شوبهەچییەکان دەیڵێن"، وتەکەی کۆتایی هات.

سەرنج بدە چۆن جوکمی دا لەسەر خەڵکی ئەم شوێنە بە کوفر لە ڕواڵەتدا، ئەمەش بەهۆی هاتنەدی سیفەتەکان تیایاندا کە دەبێتە هۆی ئەم حوکمە؛ لە بڵاوبوونەوەی کوفر لەناویاندا، و خوو پێوەگرتنیان لەسەری، و ڕاگەیاندنیان بۆ ئەم شتانە، حوکمەکەی لەسەریان پەیوەست نەکرد تەنها بەهۆی ئەوەی خاکەکەیان خاکی کوفرە جا ئاگاداربە.

پوختەی بابەتەکە ئەوەیە پێویستە جیاوازی بکرێت لە نێوان بابەتی حوکمدان لەسەر خاك (دار) و بابەتی حوکمدان لەسەر دانیشتوان؛ جا حوکمدان لەسەر خاك بەگوێرەی ئەو هۆکارە دەبێت کە خاکەکە تیایدایە لە حوکمەکان، وە حوکمدان لەسەر دانیشتوان بە سەیرکردن و سەرنجدان لە حاڵی دانیشتوانەکە دەبێت، واللّٰە المستعان.

**تەوەری یەکەم لە دەربارەی خاکەکان کۆتایی هات بە یارمەتی اللّٰە.**

## ئێستاش دەست دەکەین بە بابەتەکانی تەوەری دووەم: تەوەری کۆچکردن (الهجرة).

**کۆچکردن لە ڕووی شەرعییەوە:** بریتییە لە دەرچوون لە پێناو الله لە خاکی کوفرەوە بۆ خاکی ئیسلام.
وە دەشێت هیجرەت بەکارهاتبێت و مەبەست پێی دەرچوون بێت لە خاکی سەرپێچی و تاوان بۆ خاکی گوێڕایەڵی، وە لە خاکی بیدعە بۆ خاکی سوننەت.

### بابەتی یەکەم: حوکمی کۆچکردن.

(ابن القاسم -رحمه الله-) لە حاشیەکەی لەسەر (الأصول الثلاثة) دەڵێت: "جێگربوونەکەی زانراوە و ئاشکرایە -واتە هیجرەت- بە قورئان و سوننەت و ئیجماع، ئەو کەسەی فەرامۆشی بکات بەڵێنی بە عەزاب پێدراوە، وە زیاتر لە زانایەك ئیجماعی گێڕاوەتەوە لەسەر واجبوونی هیجرەت لە نیشتیمانی شیرك بۆ نیشتیمانی ئیسلام"، وتەکەی کۆتایی هات.

### بابەتی دووەم: حوکمی تەرك کردنی هیجرەت.

موسڵمان تەکفیر ناکرێت تەنها بەهۆی تەرك کردنی هیجرەت لەبەر فەرموودەی الله تعالى: {وَالَّذِينَ آمَنُوا وَلَمْ يُهَاجِرُوا مَا لَكُم مِّن وَلَايَتِهِم مِّن شَيْءٍ حَتَّىٰ يُهَاجِرُوا ۚ وَإِنِ اسْتَنصَرُوكُمْ فِي الدِّينِ فَعَلَيْكُمُ النَّصْرُ إِلَّا عَلَىٰ قَوْمٍ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُم مِّيثَاقٌ ۗ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ} (الأنفال: ٧٢) واتە: ئەوانەش کە باوەڕیان هێناوە و کۆچیان نەکردووە، ئەوە بۆتان نییە پشتگیریان بکەن لە هیچ شتێکدا هەتا ئەوانیش کۆچ دەکەن، خۆ ئەگەر ئیماندارانەی (کە کۆچیان نەکردووە) داوای یارمەتی و پشتگیریان لە ئێوە کرد بۆ سەرخستنی ئاینی ئیسلام، ئەوە پێویستە لەسەرتان بکەن، جگە لەسەر ئەو عەشرەت و لایەنەی کە لەنێوان ئێوە و ئەواندا پەیمانێك هەبێت (ئەو پەیمانە مەشکێنن)، خوای گەورەش بینایە بەو کار و کردەوانەی کە دەیکەن.
وەسفکردنیان بە ئیماندار و تەرك کردنی هیجرەتی لە خاکی حەرب لەگەڵ یەك کۆکردەوە.
(أبو بكر ابن العربي -رحمه الله-) دەڵێت: کاتێك الله دەفەرموێت: {وَإِنِ اسْتَنصَرُوكُمْ فِي الدِّينِ فَعَلَيْكُمُ النَّصْرُ}

مەبستی ئەوەیە ئەگەر لە خاکی حەرب داوای یارمەتی و پاڵپشتییان لێکردن بۆ دەرچوون یان ماڵ و سامان بۆ ڕزگارکردنیان ئەوا یارمەتییان بدەن، ئەمە لەسەرتان فەرزە تەنها لەسەر کۆمەڵ و لایەنێك نەبێت کە لەنێوان ئێوە و ئەواندا پەیمانێك هەیە، جا مەجەنگن لە دژیان، مەبەستی لەوەیە تاوەکو پەیمانبەستنەکە تەواو دەبێت لەسەری یان هەڵدەوەشێنرێتەوە و بەرامبەر یەك دەبن"، وتەکەی کۆتایی هات.

بۆیە لەسەر موسڵمان حەرامە بمێنێتەوە لە خاکی کوفر ئەگەر توانای نەبوو لە ئاشکراکردنی دینەکەی لەبەر فەرموودەی الله تعالی: {إِنَّ الَّذِينَ تَوَفَّاهُمُ الْمَلَائِكَةُ ظَالِمِي أَنفُسِهِمْ قَالُوا فِيمَ كُنتُمْ ۖ قَالُوا كُنَّا مُسْتَضْعَفِينَ فِي الْأَرْضِ ۚ قَالُوا أَلَمْ تَكُنْ أَرْضُ اللَّهِ وَاسِعَةً فَتُهَاجِرُوا فِيهَا ۚ فَأُولَٰئِكَ مَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ ۖ وَسَاءَتْ مَصِيرًا} (النساء: ٩٧).

(ابن كثير -رحمه الله-) دەڵێت: "ئەم ئایەتە پیرۆزە گشتییە لە دەربارەی هەر کەسێك دەمێنێتەوە و نیشتەجێ دەبێت لەناو موشریکەکان لە کاتێکدا دەتوانێت هیجرەت بکات و توانای نییە لە بەڕێوەبردن و جێبەجێکردنی دین، ئەوا ستەمکارە بۆ نەفسی خۆی و ئەنجامدەری حەرامێکە بە ئیجماع"، وتەکەی کۆتایی هات.

وە دەرخستن و ئاشکراکردنی دین تەنها بریتی نییە لە توانا هەبوون بۆ نوێژکردن و جگە لەویش، بەڵکو مەبەست لە ئاشکراکردنی دین دەرخستنی دوژمنایەتییە بۆ کافران و موشریکەکان بەپێی فەرموودەی الله تعالی: {قَدْ كَانَتْ لَكُمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ فِي إِبْرَاهِيمَ وَالَّذِينَ مَعَهُ إِذْ قَالُوا لِقَوْمِهِمْ إِنَّا بُرَآءُ مِنكُمْ وَمِمَّا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِ كَفَرْنَا بِكُمْ وَبَدَا بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ الْعَدَاوَةُ وَالْبَغْضَاءُ أَبَدًا حَتَّىٰ تُؤْمِنُوا بِاللَّهِ وَحْدَهُ} (الممتحنة: ٤) ، واتە: بەڕاستی بۆ ئێوە هەیە ئەی ئیماندااران لە ئیبراهیم و لەوانەی بڕوایان هێنابوو لەگەڵیا، سەرمەشقییەکی چاك و جوان، کاتێك بە قەومەکەی خۆیانیان وت: ئێمە بەریین لە ئێوە و لەو شتانەش کە لە جیاتی خوا دەیپەرستن، بێباوەڕین پێتان، ئیتر دوژمنایەتی و ڕقەبەرایەتی لەنێوانماندا بەرپا بووە تا ئەو کاتەی کە باوەڕ بە خوای تاك و تەنیا دێنن و هاوبەشی بۆ دانانێن.

سەبارەت بەو کەسەی وازی لە هیجرەت هێناوە و بنچینەی دوژمنایەتی لە لا هەیە -واتە دوژمنایەتییەکە بوونی هەیە- بەڵام دەری ناخات -واتە ئاشکرای ناکات- ئەوا سەرپێچیکار و گوناهبارە و کافر نییە.

پرسیارکرا لە شێخ عبد اللطيف -رحمه الله- دەربارەی ئەو کەسەی لەژێر دەسەڵاتی موشریکەکانە و تەوحیدی ناسیوە و کاری پێدەکات بەڵام دوژمنایەتیان ناکات و نیشتیمان و خاکەکانیان جێناهێڵێت، جا بەم شێوەیە وەڵامی دایەوە: "ئەم پرسیارە بەهۆی بیرنەکردنەوە و تێنەگیشتن لە وێنەی مەسەلەکە کراوە، و واتای جێ مەبەست و ویستراو لە تەوحید و کارپێکردنی، چونکە بڕوا ناکرێت تەوحیدی ناسیبێت و کاری پێبکات و دژایەتی موشریکەکان نەکات، وە هەر کەسێك دوژمنایەتییان نەکات پێی ناوترێت تەوحیدی ناسیوە و کاری پێکردووە، بۆیە پرسیارەکە دژیەکە، وە باش پرسیارکردن کلیلی زانستە، وا گومان دەبەم مەبەستت ئەوە بێت:

ئەو کەسەی دوژمنایەتییەکە ئاشکرا ناکات و جیا نابێتەوە و جێیان ناهێڵێت، وە بابەتی ئاشکراکردنی دوژمنایەتی جودایە لە بابەتی هەبوونی دوژمنایەتییەکە؛ جا یەکەمیان: عوزری بۆ دەهێنرێتەوە لەگەڵ توانا نەبوون و ترس لەبەر فەرمودەی الله تعالى: {إِلَّا أَن تَتَّقُوا مِنْهُمْ تُقَاةً} (آل عمران: ٢٨) واتە:مەگەر لەبەرئەوەی خۆتان لە شەڕیان بپارێزن و قوتار بکەن.

دووەمیان: دەبێت هەبێت (دوژمنایەتییەکە)، چونکە دەچێتە نێو کوفرکردن بە تاغوت، وە لەنێوان ئەو و خۆشویستنی الله و پێغەمبەرەکەی پەیوەستییەکی تەواو هەیە لە ئیماندار جیا نابێتەوە؛ جا ئەوەی سەرپێچی فەرمانی الله بکات بە وازهێنان لە ئاشکراکردنی دوژمنایەتی ئەوا سەرپێچیکارە و تاوانبارە، بۆیە ئەگەر بنچینەی دوژمنایەتییەکە لە دڵیدا هەبوو ئەوا هەمان حوکمی سەرپێچیکار و لە سنوور دەرچووەکانی هەیە، جا ئەگەر هاتوو لە پاڵ ئەمەشدا تەرکی هیجرەتیشی کرد ئەوا پشکێکی بەردەکەوێت لە فەرمودەی الله تعالى: {إِنَّ الَّذِينَ تَوَفَّاهُمُ الْمَلَائِكَةُ ظَالِمِي أَنفُسِهِمْ} (النساء: ٩٧)، بەڵام تەکفیر ناکرێت، چونکە ئایەتەکە بەڵێندان بە عەزابی تێدایە نەك تەکفیر، بەڵام سەبارەت بەوەی دووەم کە هیچ دوژمنایەتییەك لە دڵیدا نییە کە لێرەدا وتەی پرسیارکەرەکە تەواوە دوژمنایەتی موشریکەکان ناکات، جا ئەمە شتێکی گەورەیە و گوناهێکی مەزنە، چ خێرێك دەمێنێتەوە لەگەڵ دوژمنایەتی نەکردنی موشریکەکان؟! وە ترس لەسەر دارخورما و خانووبەرە و ماڵەکان عوزرێك نییە پێویستی بکات هیجرەت تەرك بکرێت، الله تعالى دەفەرموێت: {يَا عِبَادِيَ الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّ أَرْضِي وَاسِعَةٌ فَإِيَّايَ فَاعْبُدُونِ} (العنكبوت: ٥٦) ، واتە: (پەروەردگار بە ئیماندارانی بەگیرهاتوو لەناو کافراندا ڕادەگەیەنێت) : ئەی بەندەکانم زەوی من فراوانە، موڵکی من بەربڵاوە (کۆچ بکەن، خۆتان ڕزگار بکەن)، تەنها هەر من بپەرستن. وتەکەی کۆتایی هات -رحمه الله-.

سەبارەت بەو کەسەی هیجرەت تەرك دەکات لە خاکی کوفر وەك خۆشویستن و سەرخستنێك بۆ کافران لە خەڵکەکەی یان وەك پشتیوانی و یارمەتیدان بۆیان لەسەر موسڵمانان ئەوا کافرە وەك ئەوان.

الله تعالى دەفەرموێت: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَتَّخِذُوا آبَاءَكُمْ وَإِخْوَانَكُمْ أَوْلِيَاءَ إِنِ اسْتَحَبُّوا الْكُفْرَ عَلَى الْإِيمَانِ ۚ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ} (التوبة: ٢٣) ، واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە، باو و باپیران و براکانتان مەکەنە پشتیوان و خۆشەویستی خۆتان، ئەگەر ئەوان بێ باوەڕیان خۆش ویست و هەڵیانبژارد بەسەر ئیمان و باوەڕدا، هەرکەس لە ئێوە پشت بەوان ببەستێت و خۆشی بوێن، ئا ئەوانە هەر ستەمکارن.

(القرطبي -رحمه الله-) دەڵێت: ڕواڵەتی ئەم ئایەتە ڕووی کردووەتە هەموو ئیمانداران، و حوکمەکەشی دەمێنێت تاوەکو ڕۆژی قیامەت لە پچڕاندنی خۆشویستن و دۆستایەتی و پشتیوانی (الولاية) لە نێوان ئیمانداران و کافران، وە دەستەیەك گێڕاویەتیانەوە کە ئەم ئایەتە لە دەربارەی هاندان لەسەر هیجرەت و ڕەتکردنەوە و

جێهێشتنی وڵاتی کافران دابەزیوە، جا وتە ئاڕاستەکردنەکە لەسەر ئەمە بۆ ئیمانداران بوو ئەوانەی لە مەککە و جگە لەویش بوون لە وڵات و خاکی عەرەب، بەوەی خۆشەویستی و پشتیوانی باو و باپیران و برایانیان نەکەن جا بەمەش ببنە شوێنکەوتەیان لە شوێنی مانەوە و ئارامگەی وڵاتی کوفر". وتەکەی کۆتایی هات.

(ابن حزم -رحمه الله-) دەڵێت: "ئەمەش ( کە لە پێشدا باس کراوە ) ئەوە دەسەلمێنێت کە هەرکەسێک بەویست و ئارەزووی خۆی چووە خاکی کوفر و حەڕب و لەوێوە دژایەتی خەڵکی شوێنێك بکات کە بەدەست موسڵمانانەوەیە، ئەوە بەو کارەی موڕتەد دەبێتەوە و هەموو حوکمەکانی موڕتەد دەچەسپێت بەسەریدا لەواجب بوونی کوشتنی هەرکات دەسەڵاتی کوشتنی هەبوو، و لەحەڵاڵ بوونی ماڵ و سامانەکەی، و هەڵوەشاندنەوەی نیکاحەکەی (گرێبەستی هاوسەرگیری) و جگە لەمانەیش، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) خۆی بەری نەکردووە لە هیچ موسوڵمانێک"، وتەکەی کۆتایی هات.

(ابن تيمية -رحمه الله-) وەك سەرنجێك لەسەر ئەسەری (عبد الله بن عمر -رضي الله عنهما-) کە دەڵێت: "هەر کەسێك بمێنێتەوە لە وولاتی (الأعاجم) [جگە لە عەرەب پێی دەوترێت عەجەم] وەك ئەوان نەورۆز بکات و بەشداری کەرنەڤاڵەکانیان بکات وە هاوشێوەیان بکات و لاساییان بکاتەوە تاوەکو دەمرێت و بەردەوام بێت لەسەر ئەم ڕەفتارەی ئەوا لەگەڵ ئەوان کۆدەکرێتەوە لە دواڕۆژدا.

دەڵێت: ئەمە وا دەخوازێت کافر بێت بە بەشداری کردنی لەگەڵیان لە کۆی ئەم کارانە یان ئەمە وا لێ دەکات لە گوناهە گەورەکان بێت کە دەبێتە هۆی چوونە ناو جەهەننەم، ئەگەرچی یەکەمیان ڕواڵەتی دەربڕینەکەی بێت، جا بەشداری کردنەکە لە هەندێك لەمانەدا سەرپێچی و تاوانە"، وتەکەی کۆتایی هات.

## بابەتی سێیەم: حاڵ و بارەکانی نیشتەجێبووان لە خاکی کوفر.

(ابن حزم -رحمه الله-) دەڵێت: "بەڵام ئەو کەسەی هەڵاتووە بۆ خاکی حەڕب بەهۆی ستەمێك کە لێی دەترسێت، و دژایەتی موسڵمانان ناکات و یارمەتی کافران نادات لەسەریان، و کەسیشی دەست نەکەوتووە لە موسڵمانان تاوەکو هانای بۆ ببات: ئەمەیان هیچی لەسەر نییە، چونکە ناچارکراوێکی زۆرلێکراوە، وە باسمان کرد کە (الزهري محمد بن مسلم بن شهاب) پێداگربوو لەسەر ئەوەی ئەگەر (هاشم بن عبد الملك) بمرێت ئەوا خۆی دەگەیەنێتە خاکی ڕۆم، چونکە (الوليد بن يزيد) نەزری کردبوو بە خوێنی ئەو ئەگەر دەستی پێی بگات، کە بووە والی دوای هیشام، جا هەر کەسێك بەم شێوەیە بێت ئەوا خاوەن عوزرە، بە هەمان شێوە ئەوەی نیشتەجێبووە لە موسڵمانان لە خاکی هیند و سیند و چین و تورك و سودان و ڕۆم؛ ئەگەر توانای نەبوو دەربچێت لەم شوێنانە بەهۆی پیری و پەککەوتەیی یان بەهۆی کەمی سامان یان بەهۆی لاوازی جەستە یان

بەهۆی ڕێگا نەبوون ئەوا خاوەن عوزرە.

ئەگەر هاتوو لەوێدا دژایەتی موسڵمانانی دەکرد و ببوو بە پشتیوان و یارمەتیدەری کافران بە خزمەتکردنێك یان نووسینێك، ئەوا کافرە.

وە ئەگەر لەوێ نیشتەجێ بوو بۆ ئەوەی دونیای دەست بکەوێت، کە وەك زیممی وایە بۆیان، وە دەتوانێت خۆی بگەیەنێتە کۆمەڵی موسڵمانان و خاکیان: ئەوا دوور نییە لە کوفر، و هیچ عوزرێك نابینین بۆی، ونسأل الله العافية.

وە بەم شێوەیە نییە بۆ ئەو کەسەی لە گوێڕایەڵی کافران دانیشتبێت لە غالییەکان [وڵاتی غال] و ئەوانەش کە لەسەر ڕێگای ئەوانن و شوێنیان کەوتوون؛ چونکە خاکی میصر و قەیرەوان و جگە لەوانیش، ئیسلام تیایدا ئاشکرا و دیارە، والییەکانیان لەسەر هەموو ئەمانە بەرائەت کردن لە ئیسلام دەرناخەن بەڵکو خۆیان دەدەنە پاڵ ئیسلام، هەرچەندە لە ڕاستیدا کافرن.

سەبارەت بەو کەسەی نیشتەجێ بووە لە خاك و وڵاتی (القرامطة) بە ویست و ئارەزووەی خۆی: کافرە بەبێ گومان چونکە ئەوان کوفر و تەرك کردنی ئیسلامییان ڕاگەیاندووە، بۆیە پەنا بە الله دەگرین لەمە.

سەبارەت بەو کەسەی نیشتەجێ بووە لە شار و خاکێك تیایدا هەندێك هەواوئارەزووی دەرچوێنەر بۆ کوفر دەردەکەوێت و ئاشکرایە: ئەوا کافر نییە چونکە ناوی ئیسلام ئاشکرا و دیارە لەوێدا لەسەر هەموو بارێکەوە لە تەوحید و داننان بە پەیامی محمد (ﷺ) و بەرائەت کردن لە هەر دینێکی تری غەیری ئیسلام، وە ئەنجامدانی نوێژ و ڕۆژووگرتنی ڕەمەزان، تەواوی ئەو فەرز و دانراوانەی بریتیین لە ئیسلام و ئیمان، والحمد لله رب العالمين"، وتەکەی کۆتایی هات -رحمه الله.-

لێرەدا هاتینە کۆتایی، وصلى الله على نبيِّنا محمد وعلى آله وصحبه أجمعين.

وەرگێڕانی **پێگەی ڕاستەڕێ**




www.rras14tare.blogspot.com

١٤٣٩هـ